# ئایا جگەرەکێشان

## حەلاڵە

## لە قورئان و فەرمودەکان و ووتەی زانایان دا

## یان حەرامە ؟؟

کۆکردنەوەو ئامادەکردن و نوسینی

زانا عثمان پێنجوێنی

پێداچونەوەی

ماموٚستا محسن محمود سلیمان

پێش نوێژو ووتار خوێنی مزگەوتی صلاح الدین الایوبی لە زەڕایەن

# ئایا جگەرەکێشان حەڵاڵە لە قورئان و فەرموودەکان و ووتەی زانایان دا یان حەرامە ؟؟




ئامادەکردن و کۆکردنەوەو نوسینی:

زانا عوسمان پێنجوێنی

پێداچوونەوە و پێشەکی نوسینی:

مامۆستا محسن محمود سلیمان



پێشنوێژو ووتار خوێنی مزگەوتی صلاح الدین الایوبی لە زەڕایەن

١٤٣١هـ - ٢٠١٠ز

## پێشکەشە بە :

١- هەموو ئەوانەی کە دەیانەوێت خۆیان بپارێزن لە حەرام کراوەکان.

٢- هەموو ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت چاو ڕۆشن بن بە بەڵگەی ڕاست و دروست لەسەر حەرام کراوەکانی خوای گەورە.

٣- هەموو ئەوانەی بەردەوام لە هەوڵی بیستنی حەق و شوێن کەوتنی دان .

٤- هەموو ئەوانەی کە ئامادەن واز لەهەر کارێك بهێنن کە ببێتە هۆی تورەبوونی خوای گەورە.

٥- هەموو ئەوانەی کە توشی ئەم دەردە بوون بەڵکو خوای گەورە یارمەتی یان بدات و وازی لێ بهێنن.

٦- هەموو ئەوانەی کە لە لێپرسینەوەی بەربارەگای خوای گەورە دەترسن.

٧- هەموو موسڵمانێکی ژیرو تێگەیشتوو کە خەم خۆری خۆی و دینەکەیەتی.

# بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: ئایا جگەرەکێشان حەڵاڵە، لە قورئان و فەرموودەکان و وتەی زانایاندا؟

ناوی نوسەر: زانا عوسمان پێنجوێنی

نۆرەی چاپ: یەکەم، ١٤٣١ ك-٢٠١٠ ز

چاپخانە: چاپەمەنی سیما- سلێمانی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان – سلێمانی ژمارە (١٥٨٠)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە.

بنکەی بڵاوکردنەوە: کتێبخانەی سوننە- سلێمانی، بازاری کەنار، شەقامی مەولەوی، ژ.ت (٠٧٧٠٣٦٧٥١٤١)

کتێبخانەی سیما- چەمچەماڵ ، کتێبخانەی زانست – کەلار ، کتێبخانەی پێشین-هەولێر

## پێشەکی:

نوسینی: م.محسن محمود سلیمان

الحمدلله رب العالمین والصلاة ةالسلام علی نبینا محمدوعلی اله وصحبه أجمعین.

بێگومـــان جگەرەکێـــشان دەســـت درێژییـــەکی ئاشـــکرایەلەژیان وتەندروستی تاك وکۆمەڵ!!

چـــونکە ســـاغ بۆتـــەوە کەســـاڵانەخەڵکانێکی زۆر بـــەهۆی جگەرەکێشانەوەگیان لەدەست ئەدەن کەمەزەندەدەکرێت بەزیاتر لەچـوارملوێن ونیـو،واتەلەهـەر (٥_٦)چـرکەیەکدا کەسـێك لـە جیهاندابـــەهۆی جگەرەکێـــشانەوەچرای ژیـــانی بەدوکـــەڵی جگەرەدەکوژێتەوە.

جێگـــەی ســـەرنجەکەتوتن مادەیـــەکی زیـــان بەخـــشە لەهەمولایەکـەوە،وەتائێـستالەهەموجیهانداکەسێك نەیتوانیوەتـەنها سـودێك بۆتـوتن یـان جگـەرە بدۆزێتـەوە،کەچـی لەگـەڵ ئەمەشـداڕۆژ لەدوای ڕۆژ عاشقانی مەرگ بەدووکەڵی لەجیهاندا لەزیاد بوندان.

جێگـەی سەرسـوڕمانە جۆرێـك لەخـەڵك هـەن پـێ یـان دەوترێـت (جگەرەنـــەخۆری جگـــەرەخۆر)!!ئەمانـــەیش ئەوکەســـانەن کەلەشـوێنێکی داخـراودا دەمێنێتـەوە کەهەموهـەوای شـوێنەکە بەدوکەڵی جگەرەکێشەکان پیس بوە،لەئەنجامدا توشی نەخۆشـی ژێرپەنجەی سیەکان دەبن،وەك دەرکـەوتوە کەئـەم نەخۆشـییە لـەناو ئەوژنانەدازیاترە کەمێردەکانیان جگەرە کێشن.

وەبـــــرای بـــــەڕێزمان کـــــاك (زانــــا عوسمــــــان) هەســتاوەبەکۆکردنەوەوئامادەکردنی ئــەم بابەتــە بــەپێزە لەســەر حوکمی جگەرەکێشان .....

لەژێر ڕۆشنای بنەما گشتی یەکانی قورئـانی پـیرۆزو فەرموودەڕاست ودروستەکانی پێغەمبەرﷺوفـەتوای زانایـانی متمانـەپێکراوی جیهـانی ئیـــسلام،کـــەڕونی کردۆتـــەوە جگـــەرە کێـــشان حەرامەبـــە هەمووشێوەیەك،وەتیایداحەقی پێکاوە بەئیزنی خوای گـەورە.پاشـان دواتــر زۆریــەی شــوبهەو گومانــەکانی جگــەرە کێـشانی خـاڵ بـەخاڵ هێناوەوبە پێی تواناپەرپەرچی داوەتەوە.

وەمنــیش لەســەرەتاوەهەتاکۆتای خۆێندومەتــەوەو هەنــدێك ســەرنج وتێبینـیم لەسـەر نووسـی ،خـوای گـەورە پاداشـتی ئامادەکـاری ئـەم نامیلکەیـە بداتــەوە وبیکاتــە مایـەی واز هێنـان و سـڵەمینەوەی ئـەو کەسانەی کەدوچاری جگەرە کێشان بوون.

خـوای گـەورە یارمـەتیمان بـدات بـۆ هـەمووکارێکی چـاك و لەخراپـە بەدورمان بگرێت........

وصلی الله وسلم علی نبینامحمدوعلی آل محمد

نوسینی: بەڕێز مامۆستا محسن محمود سلیمان

پێش نوێژو وتارخوێنی مزگەوتی صلاح الدین ألأیوبي لەزەڕایەن

١٦_رجب _١٤٣١هـ

ئـەوەی سوپاسـی خـەڵكی نـەكات سوپاسـی خـواش ناكـات ، بۆیـە سوپاسـی هــەموو ئـەو كەسـانە دەكـەم كـە یارمــەتیان دام لــە ئامادەكردنی ئەم بابەتەدا، بەهەر شێوەیەك لـە شـێوەكان بێـت، وەك نوسینەوەی یان پەیداكردنی كتێب لەوبارەیەوە بـە تایبـەتی برایـانی بـەڕێزو خۆشەویستم ﴿كـاك زریـان سەرچـناری ،و كـاك هـێمن سـعید پێنجوێنی و، كـاك إبـراهیم محمـد أمـین﴾،خـوای گەورەبـە پاداشـتی گەورەپاداشتی بەخێریان بداتەوە.

لەم نوسینەدا زیاتر سود لەچەند سەرچاوەیەك وەرگیراوە وەك:

(تحقيق البرهان في شأن الدخان الذي يشربه الناس الآن: تأليف/ العــالم العلامة الشيخ مرعي بن يوسف الكرمي المقدســي الحنبلــي و بذيلــه " التعليقات الحسان" بقلم أبي عبيدة مشهور آل سلمان).

وە ( حكم الدخان والتدخين على ضوء الطب والدين: للشيخ محمد جميل زينو - كە ئێستە كۆكراوەتـەوە لـە - مجموعة رســائل التوجيهــات الاسلامية).

وە ( فتوى في حكم شرب الدخان: سماحة الامام محمد ابراهيم ال الشيخ -رحمة الله-). وە ( حكم شرب الدخان لشيخ عبــد الــرحمن ناصــر السعدي-رحمه الله- ).

وە ( حكم شرب الدخان وامامة من يتجاهر بشربه لــسماحة الــشيخ عبدالعزيز بن باز —رحمه الله- ويليه فتاوى في حكم شرب الدخان و بيعه والاتجار به لشيخ العلامة ابن باز والفتاوى اللجنة الدائمة ).

وه ( جگەره کێشان، نوسینی: دکتۆر عادل القاضـــي وەرگێڕانـی / دڵنیا عبدالله لطف الله).

وه( جگـەره کێـشان و شـێرپەنجه، نوسـینی: دکتـور سـەباح ناصـر وەرگێرانی/ ڕزگار فایەق سەعید).

وەچـەند سـەر چـاوەیەکی تـر کـه لـه شـوێنی خۆیـدا ئاماژەمـان پێکردوون. خوای گەوره نیەتەکانمان پاك بکاتـەوه تـەنها بـۆ خـۆی و لێمان خـۆش بێـت و بمانکـات بـه بـەرگری کـار لـه دینەکـەی خـۆی- آمین- .

لەم نوسراوەمدا هەرهەڵەیەکم کردبێـت لـه نـەفس و شـەیتانەوەیه وه شەریعەتی خوا لێی پاك وبەرییه، هەرچیشی موافقی قورئان وسـوننه بێت لەبەخششی پەروەردگارمەوەیه.

٤ی صەفەر ١٤٣١ی کۆچی

١٩ / ١/ ٢٠١٠ی زاینی

نوسین و ئامادەکردن وکۆکردنەوەی

زانا عوسمان پێنجوێنی

سلێمانی

# بەشی یەکەم

کورتەیەکی مێژوویی دەربارەی جگەرە کێشان[1] خۆی جگەرە کێشان لەگەڵ دۆزینەوەی کیشوەری ئەمریکا لە لایەن زانای جوگراف – کریستۆفەر کۆلۆمبس–وە دۆزرایەوە، کاتێک کە ساڵی (١٤٩٢ز) چوبۆ کیشوەری ئەمریکا بینی هەندێك لە دانیشتوانەکەی لە هیندۆسە سورەکان بەسەبیل جگەرە دەکێشن، پاشان لەساڵی (١٤٩٧ز)، واتە پاش پێنج ساڵ قەشە (ڕامۆن بان) هەواڵی توتن و بەکار هێنانەکانی لە وڵاتی یەکەمی توتنەوە لە جیهاندا بۆ کیشوەری ئەوروپا گواستەوە، وەلە ساڵی (١٥١٩ز) ، گەشتیار (ئەفیدۆ) یەکەم جار گەڵای توتنی هێنا بۆ ئەوروپا، بەڵام تۆوی توتن لەساڵی (١٥٥٩ز) لە بەرازیلەوە گەیشتە کیشوەری ئەوروپا هەر لەوساڵەدا باڵوێزی فەرەنسی لە پرتوگال (جان نیکۆت) تۆوی توتنی لە باخچەی ماڵەکەیدا چاند بۆ مەبەستی ڕازاندنەوەو جوانی چونکە گەڵاسەوزەکانی توتن گوڵی جوان و قەشەنگیان هەیە، پاشان کشتوکاڵی توتن زۆر بەخێرایی بەهەموو بەشەکانی کیشوەری ئەوروپادا بلاو بۆوە، لەسەرەتادا جگەرەکێشان لەلایەن کڵێساکانەوە قەدەغەکراو بەشتێکی قێزەون دادەنرا، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند چونکە ئەو باجانەی کەدەستەڵات دارانی ئەو ناوچانە لە جگەرە

---

[1] کتێبی گیرفان (٧٢). دکتۆر عادل هادي القاضي جگەرە کێشان وەرگێڕانی : دڵنیا عبداللە لطف اللە / لا ٧تا١٣.

کێشانەوە دەستیان کەوت زۆر بوو، هەروەها جگەرە کێشان لەو شتانەیە کە مرۆڤ بە ئاسانی لەسەری ڕادێت لەبەر ئەوە خوی جگەرەکێشان وەك چۆن ئاگر بەناو گژوگیادا بڵاو دەبێتەوە ئاوا بەهەموو بەشەکانی ئەورووپادا بڵاو بووەوەو لەوێشەوە ئەم خووە بە هەمو بەشەکانی جیهاندا بڵاو بووەوەو نزیکەی (١٢٠) وڵاتی گرتەوە بێجگە لەو شوێنانەی کە زۆر ساردن. وەلە ساڵی (١٧٢٥ز ) کۆلیجی پزیشکی میرنشینی لە لەندەن ئاگاداریەکی ڕەسمی دەربارەی مەترسیەکانی جگەرە کێشان و ئاکامەکانی کە لێی دەکەوێتەوە بڵاو کردەوە، لە ساڵی(١٨٢٨ز) هەردووزانای ئەڵمانی (بوسلت و ڕایمان) لە زانکۆی(هایدل بیرگ)ی ئەڵمانی ماددەیەکەی کاریگەریان لە توتندا دۆزیەوە ناویان نا (نیکۆتین) کە لە (جان نیکۆتین)ەوە وەرگیراوە ناوی یەکەم کەس بوو تۆوی توتنی لە ئەورووپادا چاند، وە هەردووزانای نەمساوی (د فۆرزاك و هایزمیش) لە ساڵی(١٨٦٨ز ) لە ڤێننای پایتەختەوە توێژینەوەیەکیان لەسەر نیکۆتین و کاریگەریە زیان بەخشەکانی لەسەر لەشی مرۆڤ ئەنجامدا، بەڵام پێکهاتەی کیمیایی نیکۆتین لە لایەن زانای کیمیایی (پینەر)ەوە لە ساڵی (١٨٩٣ز ) دۆزرایەوە، ئەوەی پەیوەندی بە بەرهەمهێنانی جگەرەوە هەیە لە جیهاندا کە بەشێوەیەکی زۆر لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندا پەرەی سەند بە تایبەتی دوای جەنگی(قرم) لە ساڵی (١٨٥٥ز)کە جگەرە کێشان زۆر بەخێرایی بە هەموناوچەکانی جیهاندا بڵاو بووەوە...

کورتەی باسەکە، مێژوی دوکەڵ زۆرکۆنەو بەڵگەش بۆ ئەوە دۆزینەوەی ئەو شوێنەوارانەیە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٦٠٠)ساڵ پێش زایین،

یەکێك لەو شوێنەوارانە سەبیلێکی گڵینی جگەرە کێشانە کەلەکاتی هەڵکەندندا لە کیشوەری ئەمریکا دۆزرایەوە بەلاّم سەرەتای بڵاوبونەوەی خوی جگەرە کێشان دەگەڕێتەوە بۆ (٤٠٠)ساڵ لەمەوبەر(٢)، ... پێکهاتەی دوکەڵی جگەرە پێکهاتەیەکی زۆر ئاڵۆزەو نزیکەی (٢٠٠٠) ماددەی تێدایە کە بە هۆی توێژینەوە زانستیەکانەوە دۆزراونەتەوە !!

٢ لە کتێبی: جگەرەکێشان وشێرپەنجە – د. سەباح ناسر– وەرگێڕانی: پێنگار فایەق سەعید دەڵێت:( خوی جگەرەکێشان لە نزیکەی ٤٢٠ ساڵ پێش ئێستا بڵاو بۆتەوە) لا ٧

# بەشی دووەم

## پێکهاتەکانی توتن(٣)

بە پێی ئەو توێژینەوانەی  کە زانایان کردویانە لەسەر توتن دەرکەوتووە توتن لە سێ بەش پێکدێت ئەوانەش:

١- قەتران (Tar) : ئاوێتەو تێکەڵەیەکی ئاڵۆزە کە لە کۆمەڵێك ماددە پێکهاتووە، کاریگەری قەتران دوو جۆرە: یەکەم هۆکاری سەرەکی توشبونە بەنەخۆشی شێرپەنجە، دووەم کاردەکاتەسەر بۆری هەناسەو سیەکان، دەبێتەهۆی هەوکردنی بۆری هەناسەدان و نەخۆشییەکانی تری هەناسەدان، کە بەکۆکە دەست پێدەکات لەلای جگەرەکێش، قەتران: بریتیە لەو ماددە زەردەی کە لە کاتی سوتانی توتن لە نزیك فلتەرەکە زۆر دەبێتەوە وەزۆرێك لە ئاوێتەکانی توتنی تێداهەیەو بە سوتان لە ناوناچن و ناگۆڕێن ....

٢- نیکۆتین: (Nicotine) هۆیەکە بۆ بەرز بونەوەی فشاری خوێن (Blood pressure) وزیادکردنی ژمارەی لێدانی دڵ(Heart rate) و نیشتنەوەی چەوری لەناو خوێن بەرەکاندا، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە زیاد بونی ڕێژەی توشبوان بە جەڵتەی دڵ ( Heart attack) لە ناو جگەرە کێشاندا هۆکارەکەی نیکۆتینی جگەرەیە ... ڕێژەی نیکۆتین لەتەنها یەك جگەرەدا کە مرۆڤ هەڵیدەمژێت دەکاتە (١-٢ملگرم) واتا هەمان ڕێژە لە مادەی ژەهراویدا ... .

---

٣ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو / ل ٨ تا ١٠

٣- یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن (Carbon monoxide) توێژینە نویێ یەکان لە بارەی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن مەترسی ئەم ماددەیە دەخەنە ڕوو، پێیان وایە لە قەتران ونیکۆتین مەترسی زیاترە، لەسەر ژیانی مرۆڤ ئەم ماددەیە دەبێتە هۆی زیاد بونی نەخۆشیەکانی دڵ و کاریگەری خراپ لەسەر کۆرپەلە پێش لە دایك بونی دروست دەکات، لە ڕاستیدا تارێژەی قەتران زیاد بکرێت لە یەك جگەرەدا ئەوەندەش یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن زیاد دەبێت.

دوکەڵی جگەرە ماددەیەکی تێدایە دەبێتە هۆی بریندار کردنی سییەکان، هەروەها ئەو ماددانە لەخۆدەگرێت کە دەبنە هۆی توشبون بە شێرپەنجە لەوانە(ئەلرۆماتیك) و (هایدرۆکاربۆن) و(فینۆل)و چەندان ماددەی تر ...

ئەمە باسێکی کورتە سەبارەت بە جگەرە کە چەندین نەخۆشی کوشندەی وەك : شێر پەنجەی دەم ولێو، شێرپەنجەی سییەکان، شێرپەنجەی میزەڵدان، نەخۆشیەکانی بۆری هەناسە، فشاری خوێن، جەڵتەی دڵ و نەخۆشی خوێن بەرەکان، نەخۆشی گەدە، نەخۆشیەکانی دان، سەرەتان، سیل، نە خۆشییەکانی گەدەو ڕیخۆڵەو نەخۆشیەکانی دەمارەکانی مێشك... (٤). وەك زۆرێك لە ناوەندەکانی توێژینەوەکان لە زانستی پزیشکیدا ڕایان گەیاندووە کە(٩٠٪) ئەوانەی کە توشی سەرەتان دەبن جگەرە کێشەکانن، تەنها (١٠٪) ئەوانەی ترن کە جگەرە کێش نین.

---

4 بڕوانە: موسوعة التدخین / د. نضال سمیع عیسی، التدخین اضرارە وتحریمە في القرآن الکریم / د. مصطفی ابراهیم الزلمي . جگەرەکێشان و شێرپەنجە/ د. سەباح ناصر ، جگەرەکێشان/ د. عادل هادي القاضي، لەم نوسراوانەدا بەدواداچونێکی زۆرکراوە لەسەر ئەو نەخۆشیانەی کەلە جگەرە کێشانەوە توش دەبێت، وە چەندین ئامار ئامازە پێدراوە گەر دەتەوێت سەیریان بکە.

شێخ (جميل زينو) خوا بیپارێزێت، دەفەرموێت: ئەندازیارێکی کشتوکاڵی بۆی باس کردم کە کاتێك توتن دەڕوێت ئاژەڵ و باڵندەکانیش نزیکی نابنەوە چونکە بە غەریزەی خۆیان دەزانن کە زەرەرمەندە!!! (٥)

وە هەروەها جگەرە کێشان زیانی هەیە بۆ سەر ژیانی خەڵکی بەوەی کە هەوا پیس دەکات بە تایبەتی گەر لە ژوورێکدا یان لە ناو ئۆتۆمبیلیدا بکێشرێت زیانی زۆری دەبێت بۆ ئەوانەی دەوروبەری!!! (بە داخەوە هەندێك کەس هەست بەوە ناکەن کە کارێکی ناپەسەندە لە کاتێکدا جگەرە دەکێشن لە کۆڕو کۆبونەوە کاندا یان لە ناو- پاس و ئۆتۆمۆبیل- دا، دەبوایە خۆیان بزانن کە کارێکی خراپەو وازی لێ بهێنن!!!)

وەهەروەهاجگەرەکێشان لەماڵەوەزیانێکی زۆردەدات لەسەرجەم ئەندامەکانی خێزان - بە تایبەت ئەگەر منداڵی بچوکیان هەبێت- (چونکە جگەرەکێش تەنها ١٥٪ ی دوکەڵەکە هەڵدەمژێت وە ٨٥٪ ی دەداتەوە.)

ئیتر چۆن پیسکردنی ئاوی خەڵك حەرامە ئەوا پیسکردنی هەواش لە بەندەکانی خوا بەچەندین قات حەرامە!!

هەندێك لە جگەرەکێشەکان جگەرە دەکێشن تا دەگەنە بەردەرگای مزگەوت پاشان فڕێی دەدەن و دێنە ڕیزی نوێژخوێنانەوە و بەو بۆنەناخۆشە ئازاری مەلائیکەت و نوێژخوێنانیش دەدەن(بە داخەوە جاری وا بووە کەسێك لەبەر بۆنی ناخۆشی جگەرەکێشێك خەریك بووە نوێژەکەی ببڕێت یان هەنگاوێك بچێتەپێشەوە،یان دواوە !!! ئەم کارە زۆر نەشیاوە سوێند بەخوا تاوانبارن لەسەر ئەو ناڕەحەت کردنەی

---

٥ مجموعة رسائل التوجيهات الاسلامية لاصلاح الفرد والمجتمع / للشيخ جميل زينو ج١/ ص ٣٤٦

موسوڵمانان ! ! !) لە کاتێکدا ئیسلام داوای لێکردوین کە موسوڵمان چوو بۆ مزگەوت بۆ نوێژ دەبێت بۆنی خۆش بێت و سیواك بکات(٦).

هەروەها جگەرەکێشان زیانی ماددی زۆریشی هەیە بڕوانە جگەرە کێشێك چەند پارە دەدات بە جگەرە؟ دوایی بزانە مانگی چەند دەکات؟ دوایی بزانە ساڵی چەند دەکات؟ ئەگەر ئەو پارەیەی بدایە بە شتێکی بەسود بۆ ماڵ و منداڵی باشتر نەبوو؟ بێگومان چاکتردەبوو، وە هەروەها بزانە ساڵانە لە جیهاندا چەندەپارە دەدرێت بە جگەرە؟ ! !

وە هەروەها دەبینین جگەرە کێشەکان زووزوو پۆشاك دەکڕن چونکە بە جگەرەکانیان دەیسوتێنن کاتێك بە دەستیانەوەیەو ئاگایان لێنییە یان لێیان بەردەبێتەوە پۆشاکەکانیان دەسوتێت! ! وە چەندین بەنزین خانەو چاپەمەنی و دارستانی گەورە سوتاون بەهۆی فڕێدانی جگەرە یەکەوە کە ئاگری پێوە بووە! ! ! وەهەروەها گەر سەیر بکەین ئەو جگەرانە زۆرینەی لە وڵاتانی کوفرەوە دێن، ئێمەش پارەی پێدەدەین لە کاتێکدائێمە بۆ خۆمان پێویستمان بە پارەو سامانە تا پیرۆزیەکانمانی پێ بپارێزین وە یارمەتی هەژاران و نەدارانی موسوڵمانانی پێدەین.(٧) فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ ! ! !

هەروەها جگەرە کێشان زیانی ڕەوشتیشی هەیە وەك: دەبینین کاتێك کە گەنجێك فێری جگەرە کێشان دەبێت و پارەی پێ نییە یان لێی دەبڕێت،

---

٦ مجموعة رسائل التوجيهات الاسلامية لاصلاح الفرد والمجتمع / للشيخ جميل زينو ج١/ ص ٣٤٨-٣٤٩

٧ مجموعة رسائل التوجيهات الاسلامية لاصلاح الفرد والمجتمع / للشيخ جميل زينو ج١/ ص ٣٤٩-٣٥٠ کە لە چەند خاڵێکدا باسی کردووە ئێمە لێرەدا بە تێکەڵی و پوختی باسی دەکەین.

ئەوە پارە لە دایك وباوكی دەدزێت بۆ ئەوەی جگەرەی پێ بكڕێت!!
هەروەها جگەرەكێشان چاولێكردن و لاسایی كردنەوەی دوژمنانە، چونكە دوژمنان و بێباوەڕان جگەرەدەكێشن لەگەڵ عارەق خواردنەوە بەدەم بلیاردو قومارو ئافرەتی ڕاقیسە لە ناو نادیەكانیاندا!! ئیتر چۆن دەبێت موسوڵمان چاو لەوان بكات و لاساییان بكاتەوە؟ هەروەها جگەرە كێشان زیانی زۆر دەدات لە دەمارەكانی مێشك و – عەصاب – بۆیە دەبینیت ئەوانەی كە جگەرەكێشن زۆربەیان بەبەردەوامی تووڕەو دەمپیس و شەڕەنگێزن لەگەڵ خێزان و ماڵومنداڵیاندا یان لەگەڵ دایك و باوك و خوشك وبراكانیدا، جاری واهەیەبەهۆی تووڕەبوونەوەتوشی كوفروجنێودان ئەبێت بەخوای گەورە_پەنابەخوا_یان لەسەر شتێكی سادە خێزانەكەی تەڵاق دەدات یان كەسێك دەكوژێت – پەنا بەخوا– كە ئەو كارانە هۆكارێكی سەرەكیان بریتیە لە جگەرەكێشان!!!
وەهەروەهاجگەرەكێشان لەلایەن گەنج ومێردمنداڵ وقوتابییەكانەوە نیشانەی لاساریو لەخشتەترازانیانە،نەك نیشانەی چاكی وپیاوەتی وبەئەدەبی بێت!!!(٨)

---

٨ مجموعة رسائل التوجيهات الاسلامية لاصلاح الفرد والمجتمع. بەدەستكاریەكی زۆرەوە.

## بەشی سێیەم:

## ئایا جگەرەکێشان حەرامە؟(٩)

پرسیار زۆر دەکرێت کە ئایا جگەرەکێشان حەڵاڵە یان حەرامە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: جگەرە لەسەردەمی پاکی پێغەمبەردا ﷺنەبووە، بەڵام لە ئایینی ئیسلامدا دەقی گشتی وامان هەیە کە حوکمەکەی هەموو شتێك دەگرێتەوە کە دروست دەبێت و دادەهێنرێت هەتا ڕۆژی دوایی، واتا ئەوشتانە قیاس دەکرێن و دەخرێنە ژێر ئەو یاساگشتیانە، بۆچونی ڕاست ئەوەیە کە جگەرەکێشان حەرامەو بەهیچ جۆرێك حەڵاڵ نییە بەم بەڵگانەی لای خوارەوە:

١-خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾(١٥٧ الاعراف) واتە: (پێغەمبەرﷺهەمووشتێکی پاکو خاوێنیان بۆحەڵاڵ دەکات وهەمووشتێکی پیس وزیانبەخشیان لەسەر حەرام دەکات).

((خوای گەورە هەمووشتەپیسەکانی حەرام کردووە هەتاڕۆژی قیامەت ئیتر هەرناوێکی هەبێت، جگەرەش لە شتە پیسەکانە چونکە زەرەرمەندەو بۆنی پیس و ناخۆشە))(١٠).

---

٩ بڕوانە: مجموعة رسائل التوجيهات الاسلامية لاصلاح الفرد والمجتمع ج١/ ص ٣٥١-٣٥٣.

١٠ قال أبي طيب صديق بن حسن: ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ وقيل هو كل ما يستخبثه الطبع أو تستقذره النفس فان الاصل في المضار الحرمة ألا ماله دليل متصل بالحل) فتح البيان ج٥/٣٥.

٢- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ (البقرة ١٩٥) (١١). واتە : ( بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە مەترسیەوە).

وەکو ڕون وئاشکرایە ( جگەرەش دەبێتەهۆی چەندین ناڕەحەتی و نەخۆشی کوشندە وەك سیل و سەرەتان، کە مرۆڤ بە هیلاکدا دەبەن،کەس بەوە خۆی هەڵ نەخەڵەتێنێت وبڵێت من (فلتەر)بەکاردەهێنم وزیانی نابێت بۆم،بەڵکو بەو فلتەرەشەوە هەر زیاندەدات لەلاشە وەك زانستی پزیشکی سەلماندویەتی

٣- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ﴾ (النساء ٢٩). (١٢) واتە: (بەدەستی خۆتان مەکوژن ...). جگەرە

---

وفي كتاب " الدرر النثير في اختصار الحافظ أبن كثير" ... ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ فهذه الاية تحرم كلّ خبيث ماكولا أو مشروبا ألى يوم القيامة مهما غيروا أسمه أو لونه) أختصره محمد بن موسى آل نصر بتخريجات الامام محمد بن ناصرالالباني ص/٣٢١.

وقال الشيخ محمد بن صالح العثيمين –رحمه الله– (... في قوله تعالى ﴿ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ ﴾ معنى الاية الكريمة: أنه لم يحرم الا ماكان خبيثاً، وان جميع المحرمات خبائث...) جامع الاحكام فقه السنة ج٤/ص٢٣٢.

١١ قال الامام الشوكاني – رحمه الله– ( ... ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ ... فكل ما صدق عليه أنه تهلكه في الدين أو الدنيا فهو داخل في هذا وبه قال ابن جرير الطبري ...) فتح القدير / ص١٢٥ وانظر فتح البيان في مقاصد القرآن ج١/ص٣٩٢.

وقال الشيخ محمد بن صالح العثيمين – رحمه الله– في فوائد هذه الآيه : ومنها: تحريم الإلقاء باليد إلى التهلكة؛ لقوله تعالى: ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ والإلقاء باليد إلى التهلكة يشمل التفريط في الواجب، وفعل المحرم؛ أو بعبارة أعم: يتناول كل ما فيه هلاك الإنسان، وخطر في دينه، أو دنياه. ومنها: أن ما كان سبباً للضرر فإنه منهي عنه؛ ومن أجل هذه القاعدة عرفنا أن الدخان حرام؛ لأنه يضر باتفاق الأطباء، كما أن فيه ضياعاً للمال أيضاً؛ وقد نهى (ﷺ) عن إضاعة المال. التفسير الثمين للعلامة العثيمين ج٢/ص٩٥.

کێشانیش خاوەنەکەی بە هێواشی بەرەو لە ناوچون دەبات بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێت، ئەوەش بە خۆ کوشتنێکی ناڕاستەوخۆ دادەنرێت).

وەخوای گەورە کە باسی عارەق و قومار دەکات لە بارەیەیانەوە دەفەرموێت : [وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا] (١٣)(البقرة ٢١٩) واتە: (زیانیان زۆرترە لە سودەکەیان).(مەبەست بەسودی مەشروبات کەسابەت وبازرگانی دونیایە وبەس وەهیچ سودێکی جەستەی بۆمرۆڤ نییە)جگەرەش زیانی زۆرترە لە سودەکەی، بگرە هەموی زیانە.

٥- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا * إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا﴾ (الاسراء٢٦-٢٧) (١٤)

---

١٢ قال ابوطيب صديق بن حسن: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ﴾ باقتراف المعاصي لا يفعل شئاً يستحث به القتل ... ولا مانع من حمل الاية على جميع هذه المعاني ومما يدل على ذلك احتجاج عمرو بن العاص بها حين أجنب في غزوة ذات سلاسل فقرر النبي ﷺ احتجاجه وهو في مسند أحمد وسنن ابي داود وغيرهما ... فتح البيان في مقاصد القرآن ج٣/ص٩٥.

وقال الشيخ أبوبكر الجزائري : (حرمة قتل المسلم نفسه أو غيره من المسلمين؛ لأنهم أمة واحدة). أيسر التفاسير لكلام العلي الكبير ج١ / ص٢٩٧.

١٣ قال الشيخ محمد بن صالح العثيمين – رحمه الله- (قوله تعالى: ﴿وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا﴾ يعني: ما يترتب عليهما من العقوبة أكبر من نفعهما؛ لأن العقوبة في الآخرة؛ وأما النفع ففي الدنيا؛ وعذاب الآخرة أشق، وأبقى). تفسير سورة البقرة للشيخ ابن عثيمين ج٣/ ص٦٩

١٤ قال الامام الشوكاني : (... قال أشهب عن مالك: التبذير هو أخذ المال من حقه ووضعه في غير حقه، وهو الاسراف وهو حرام لقوله ﴿إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ﴾ ... والاسراف في الانفاق من عمل الشيطان فاذا فعله احد من بني ادم فقد اطاع الشيطان واقتدى به... وفي هذه الاية تسجيل على المبذرين بمماثلة الشياطين، ثم التسجيل على جنس الشيطان بانه كفور، فاقتضى ذلك أن المبذرين مماثل للشيطان وكل مماثل للشيطان له حكم الشيطان وكل شيطان كفور فالمبذر كفور) فتح القدير / ص٨١٩.

قال الشافعي رحمه الله: التبذير انفاق المال في غير حقه ولا تبذير في العمل الخير، قال القرطبي : وهذا قول الجمهور.

واتە: ( لەماڵی خۆتان دەست بڵاوی مەکەن لە ڕاددەی پێویست بێگومان ئەو کەسانەی کە دەست بڵاون و ...امانی خۆیان بێ هودە لە ڕێگای خراپەکاری و گوناهدا خەرج دەکەن ئەوانە برای شەیتانە کانن، شەیتانەکانیش کافرو پێنەزانن بەرامبەر بەبەخششەکانی خواو لە ڕێبازی ڕاست لایداوە، ڕێگای چەوت و تاریکایی گرتۆتە بەر).

کڕینی جگەرەش ماڵ سەرف کردنە لە شتی بێهودەو زەرەرمەنددا-وە برایەتی کردنی شەیتان ولاسای کردنەوەیەتی لەبەفیڕۆدانی ماڵداوئەمەش حەرامە )٠

٦- خوای گەورە لەبارەی خواردنی ئەهلی دۆزەخەوە دەف.ەرموێت: ﴿لَيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِنْ ضَرِيعٍ * لَا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِنْ جُوعٍ﴾(الغاشية٦-٧). واتە: هیچ خواردنێکیان نادرێتێ گیای حوشترخۆرەی دڕکدار نەبێت،کەتەنها حوشتر دەیخوات ئەویش ئەگەر سەوز بێت ووشك نەبوبێت، کە وشك بوو حوشتریش نایخوات، ئەویش خواردنێکە هیچ وزەیەك نابەخشێت و برسێتی لانابات).

جگەرەکێشانیش هیچ وزەو توانایەك نابەخشێت و برسێتی لانابات وەك خواردنی دۆزەخیەکان وایە جا کە سودی نەبێت و زەرەری هەبێت ئەوە خواردنی حەرامە.

---

قال الكرخي : وكذلك من رزق الله جاها او مالا فصرفه الى غير مرضاة الله كان كفورا لنعمة الله لانه موافق للشيطان في الصفة والفعل. فتح البيان ج٧/ ص ٣٨٠-٣٨١

قال الشيخ محمد سليمان الاشقر: (﴿وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا﴾ وهو الاسراف في المذموم في الحلال الانفاق في غير حق وان كان يسيرا... والاسراف في الانفاق من الشيطان فاذا فعله أحد فقد أطاع الشيطان واقتدي به ...). وقال تعالى:﴿وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾(١٤١ الانعام) زبدة التفسير/ص٢٨٤

**٧- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾(البقرة١٩٠)(١٥) واتە: ( دەست درێژی مەکەن بەڕاستی خوای گەورە دەست درێژکارانی خۆشت ناوێت).**

**ئەو پارەیەی کە دەدرێت بە جگەرە واجبە لەسەرت سەرفی بکەیت بۆ ماڵ و منداڵت لە خێرو چاکەدا ، کەسەرفت کرد لە خراپەدا ئەوەدەست درێژیت کردۆتە سەر مافی ئەوان ئەوەش کارێکی حەرامە.(١٦)**

**٨- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا﴾ (النساء/٥) واتە: (ماڵ و سامانی خۆتان مەدەنە دەست جاحێڵ ونەزان خەرجەکان، ئەو هەتیوانەش کە هێشتا پێنەگەیشتون و نەزان خەرجن، ئەگەر سامانێکیان هەبێ لای خۆتان ڕایبگرن و مەیدەنە دەستیان کە خوا کردوویە هۆی ئەشونماو گوزەرانتان ).(١٧)**

**٩- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ﴾(الانعام١٤٢) واتە: (هەرگیز شوێن نەخشەو**

---

١٥ قال الشيخ محمد بن صالح العثيمين – رحمه الله- من فوائد هذه الاية: تحريم الاعتداء حتى على الكفار، لقوله تعالى: ﴿وَلَا تَعْتَدُوا﴾، وعلى المسلمين من باب أولى ... التفسير الثمين للعلامة العثيمين ج٢/ ص ٨٦

١٦ گومانی تێدانییە کە خوای گەورە تەنها شتە پاکەکانی حەلاڵ کردووە پیسەکانیشی – کە یەکێکیان جگەرەو توتنە – حەرام کردووە لە ئایەتە گشتیەکاندا، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾ ، ﴿يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾، ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾، ﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ﴾.

١٧ بڕوانە تەفسیری ڕامان / م. أحمد کاکە محمود

هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئاشکراتانە).

گرتنە بەری ڕیچکەی زیان بەخش - وەك جگەرە کە زیان بەخشە - ڕۆیشتنە بەدوای هەنگاوەکانی شەیتاندا ، وە بەبەڵگەی ئەو ئایەتەی سەرەوە شوێن کەوتنی ڕێگای شەیتانیش حەرامە.(١٨)

١٠- پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرموێت: (لا ضرر ، و لا ضرار) (١٩) واتە: ( نە زیان بەخۆت بگەیەنە وەنە بەخەڵکی). ئەم فەرمودەیە لەسەداسەد بەڵگەیە بۆ حەرامێتی جگەرە چونکە رسول اللهﷺ فەرمویەتی زیان بەخۆتان و خەڵکی مەگەیەنن، دەی جگەرەکێش وەك لە پێشدا باسکرا زیان دەگەیەنێت بە خۆی و بە خەڵکیش، ئیتر بۆچی گوێڕایەڵ نابن بۆ فەرمانی پێغەمبەر ﷺمەگەر خوای گەورە نەیفەرمووە: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾(الحشر٧)، واتە: (ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ بۆی هێناون - فەرمانی پێکردون - وەریگرن، وە ئەوەی ڕێگری لێکردون وازی لێبێنن )، هەروەها فەرمویەتی : ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾(آل عمران٣١) واتە: (ئەی موحەممەد ﷺبڵێ ئەگەر خواتان خۆش دەوێت،گوێڕایەڵی من بکەن و شوێنم بکەون، خواش

---

١٨ تەماشای کتێبی (التدخين و اضراره وتحريمه في القرءان) د. مصطفى ابراهيم الزلمي ص٤بکە

١٩ حديث صحيح رواه أحمد ج١/ص٣١٣، وابن ماجة برقم ٢٣٤٠ والبيهقي ٧/٦، وانظر سلسلة الاحاديث الصحيحة رقم ٢٥٠.أنظرالأرواء ج ٣ ص٤٠٨-٤١٤رقم ٨٩٦

وقال الامام ابن دقيق العيد : اعلم ان من أضر بأخيه فقد ظلمه والظلم حرام. الشرح الكبير على الاربعين النووية ص/٤٦٣.

ئێوەی خۆش دەوێت ) شێخی سەعدی دەفەرموێت: حەرامکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ هەر شتێك وەك حەرامکردنی خوایە بۆ ئەو شتە لە حوکومدا. بۆیە ئەم ئایەتە زانایان ناویان ناوە، (آیـة الامتحـان والاختیـار) ئایەتی تاقیکردنەوە، بۆچی؟! چونکە بەوەدا دەر دەدەکەوێت کە کێ ڕاست دەکات و کێ ڕاست ناکان، ئەگەر پێی گوترا پێغەمبەری خواﷺ وا دەفەرموێت و ئەمری بە فلآنە کار کردووە ئەویش کردی و گوێڕایەڵی بوو، وە کە گوترا نەهی کردووە لەو کارە و لەو گوتەیە و حەرامی کردووە ئەویش گوێڕایەڵی بێت، ئەوە ڕاست دەکات لە خۆشەویستیەکەیدا بۆ پێغەمبەر ﷺ وە ئەگەر پێچەوانە بوو ئەوە ئیتر دیارە کە درۆدەکات و فێڵ لە خۆی دەکات). چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ) (٢٠) واتە: ( نەهیم لەهەر شتێك کرد ئەوا دوربکەونەوە لێی و مەیکەن).

١١- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ كَرِهَ لَكُمْ ثَلاَثاً قِيلَ وَقَالَ ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ)(٢١)، واتە: (خوای گەورە سێ شتی پێناخۆشە" کەلەناوئێوەدا هەبێت" ووتی ووتی و وتیان و ئەڵێن، وە سەرفکردنی ماڵ لە شتی بێهودەدا، وە زۆر پرسیار کردن لە شتی بێسود )، زۆر بەجوانی دیارە کە خوای گەورە پێی ناخۆشە پارە لەشتی بێ هودەدا سەرف بکرێت "

---

٢٠ البخاري و مسلم

٢١ متفق عليه : وفي صحيح الترغيب والترهيب / ٢٥٠٧،وقالﷺ{...وكره لكم:قيل وقال وكثرة السوال وإضاعة المال}،مختصر مسلم للالباني١٧٥٧،صحيح الجامع ج١ص٣٦٠رقم١٧٤٩،غايةالمرام٦٩

باشە لە جگەرە بێ هودەتر چی هەیە " دەی کەسێك کەبەڕاستی خوای خۆش بوێت کارێك ئەنجام دەدات کە خوا پێی ناخۆش بێت؟ بێگومان کەسێك ڕاست بکات لە خۆشەویستی بۆ خوادا تەنانەت نەفسیشی دادەنێت لە پێناوی وازهێنان لە کردەوەیەك کە تیایدایەو خوا پێی ناخۆشە )، وەك چۆن ئیمامی ئەبو بەکری صدیق رضي الله عنه، تیکە نانێکی لە قورگی خۆی دەر هێنایەوەو بەزۆر خۆی ڕشاندەوە تاکو یەك تیکەی حەرام نەخوات، ئیتر هاوەڵان پێیان فەرمووە خەریکە خۆت بەهیلاکدادەبەیت بەم کارەت!! ئائەمە نمونەی ترسان و خۆشەویستییە بۆ خوا، ﷻ

١٢- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِى جَارَهُ) (٢٢) ، واتە: (هەرکەسێك باوەڕی بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە بائازاری دراوسێکەی نەدات) وەدراوسێ تەنها مەبەستی لە دراوسێی ماڵ نییە، بەڵکو کەسێك لەلات دادەنیشێت یان لە سەیارەیەکدایە کەتۆی تێدایت ئەوە دراوسێتەو نابێت ئازاری بدەیت.(٢٣).

---

٢٢ البخاري، وأنظر صحيح الجامع الصغير، رقم ٦٥٠٤

٢٣ شەرحی فەرمودەکە بەم شێوەیەیە ("مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ " هذه جملة شرطية، و جوابها " فَلاَ يُؤْذِى جَارَهُ " والمقصود بهذه الصيغة الحث والاغراء على توقير الجار كأنه قال : إنْ كُنْتَ تُؤمن باللهِ واليومِ الآخرِ فلا تؤذِ جارك.

جگـەرە کـێش ئـازاری مـاڵ و منـداڵ و مـەلا ئیکـەت و نوێـژخوێنانی تەنیشتیشی دەدات، ئەوەش هەڕەشەیەکە لەلایـەن پێغەمبـەری خـوا ﷺ وە کە دەفەرموێت هەرکەسێك باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە با ئەو کـارە نەکات).

١٣- یاسایەکی شەرعی ئوصولیمان هەیە کـە دەفـەرموێت: (کل مـا ثبت ضرره ثبت تحریمه) واتە: ( هەر شتێك چەسپا کەزەرەرمەندە، ئەوا حوکمی حەرامێتی بەسەردا دەچەسپێت) هەروەها یاسایەکی تریشمان هەیە کەهەمان مانای یاساکەی سەرەوەی هەیە کە دەڵێـت: (متى ثبت الضرر وجب رفعه، ومتى ثبت الإضرار وجب رفعه مع عقوبـة قاصـد الإضرار).

جگەرەکێشان زانستی پزیشکی دەریخستووە کـە چـەندە ترسـناکە وە لـە شـەریعەتی ئیسلامیـشدا حـەرامکراوە، وە زانایـانی ئـسلام بەحـەرامیان زانیوە ! ! کەواتە چەسپا کە زیان بەخشە، بۆیە حوکمی حەرامی بەسـەردا دەچەسپێت و هیچ گومانی تێدا نیە).

ئەمانـە چـەند بەڵگەیـەك بـوون لەسـەر حـەرامێتی جگەرەکێـشان، ئـیتر حەرامێکەی بۆ ژن و پیاو وەکویەکەو هیچ جیاوازیەکی تێدا نییە، بگرە بـۆ ئافرەتان زۆر خراپترە بەتایبـەتی کـاتی دووگیـانی زیـانێکی زۆردەدات لـە کۆرپەلەکەی، زۆرجار جگەرەکێـشانی دایـك دەبێتـە هـۆی لەدەسـت دانـی چـاوی منداڵەکـەو بـەنابینایی لـەدایك دەبێـت،جگەلـەوەش جگـەرەکێش بەهۆی جگەرەکێشانەکەیەوەخۆی بێ بەش دەکات لەچەندین خێر وچاکە وەك:

١-دور كەوتنەوەلەكۆڕی پیاوچاكان وزانایان چونكە خۆی ناگرێت ئەوماوەكەمەجگەرەنەكێشێت ودەستبەرداری ببێت یان ئەوەیەبۆنی جگەرەی لێدێت وڕووی نیەو شەرم دەكات كەلەومەجلیسەدا دابنیشێت بەهۆی ئەم خراپەوەبێبەش دەبن لەزانستی بەسود وخێرو بەرەكەتی كۆڕی زانایان .

٢-گرانە لەسەر زۆرێك لەجگەرەكێشەكان كەئامادەی پێنج فەرزەی نوێژی جەماعەت ببن یان كەبانگ دەفەرموێت لەبەردەرگای مزگەوت دەوەستن تاقامەتی نوێژ دەكرێت دوای بەپەلەدێتەریزی كۆتای تافریابكەوێت !!بۆچی ؟؟چونكە خۆی دەزانێت كەبۆنی دەم وپۆشاكی ناخۆشە و بۆنی جگەرەیە !!كەئەمەش دوورە لەرەوشتی موسوڵمانەوە كەنوێژكۆتای دێت بەپەلەدەچنەدەر تاجگەرەكەبكێشن لەم حاڵەتەشدا،بێ بەش دەبن لە:

١_ریزی یەكەم وپاداشتێكی زۆریان لەكیس دەچێت !!

٢_زیكری دوای نوێژەكان وسونەتەكانیش دەفەوتێنێت تابەپەلەبچنەدەرەوەبۆجگەرەكێشان

٣-زۆرێك لەجگەرەكێشەكان گرانەلەسەریان كەڕۆژووی فەرزی مانگی ڕەمەزان بگرن بگرەهەیانە لەبەر خۆنەگرتن لەسەرجگەرەنەكێشان ڕەمەزان بەڕۆژوونابن هەیەبەڕۆژودەبێت بەڵام ڕۆژووەكەی بەجگەرەدەشكێنێت -إنالله وإناإلله راجعون-

یان شەوەکەی وپارشێوەکەی هەقی ڕۆژەکەی دەکاتەوەبگرەزۆر جـــار بەزیادیـــشەوە ! ! !کەئـــەوەیش فێڵێکـــی تـــری شەیتانەلەموسوڵمانان ! ! !

٤-هەروەها ئەو موسوڵمانانەی کەجگەرەدەکێشن وخوای گەورە بۆی ئاسان کردوون بچن بۆحەج کردن لەوێش لەبری ئەوەی کەخۆیان خەریك بکەن بەزیکرو نوێـژو دوعـاو ......دەچـن جگەرەدەکێشن هەتالەڕۆژی عەرەفەشدا کەیەکێکەلەگەورەترین ڕۆژەکان وڕۆژی دووعاو نوێژو قورئـان خوێندنە لەباتی سەرقاڵ بونـت بەجگەرەکێـشان لـەم ڕۆژەپیرۆزەدائـەی بۆبـەدڵێکی پڕلـەجۆش وخرۆشـەوەناپاڕێیتەوە لەپـەروەردگارت کەیارمـەتیت بدات بۆوازهێنان لەجگەرەکێشان.

التدخين بين الطب والدين/ص٦٣-٦٦بەدەست کارییەوە

# بەشی چوارەم

## فەتوای زانایان لەبارەی حوکمی جگەرەکێشانەوە

زانایانی پایەبەرزو ڕاستگۆی ئیسلام هەرکاتێك هەستیان کردبێت کە بەلایەك ڕوو لە موسوڵمانان دەکات بەزویی قسەیان لەسەر ئەو فیتنەیە کردووەو موسوڵمانانیان ئاگادار کردۆتەوە لەو کارە خراپەو بەگوێرەی بەڵگەی قورئان و فەرمودە ڕونیان کردۆتەوە تاموسوڵمانان نەکەونە هەڵەوە و ووریابن لێی، جا جگەرەش وەك یەکێك لەو فیتنانە زانایان قسەیان لە بارەیەوە کردووە، لێرەدا ئامارەبەهەندێك لە فەتوای زانایان دەکەین:

١-لەناو زانایان و شەرعزانانی مەزهەبی ئەبو حەنیفەدا رحمە الله کە جگەرەیان بەحەرام زانیوە " الشیخ محمد العیني رحمە الله" کە نوسراوێکی هەیە بەناوی "تحریم التدخین" لەوێدا بەحەرامی زانیوەو فەرمویەتی لەبەر چەند هۆیەك حەرامە: زەرەر مەندە بۆلاشە، بۆنی ناخۆش وپیسە، سەرفکردنی ماڵە لە بەتاڵدا. هەروەها الشیخ أبو الحسن المصري الحنفي رحمه الله فەرمویەتی : ( الاثار النقلیة الصحیحة والدلائل العقلیة الصریحة تعلن بتحریم الدخان) (٢٤).

لەزانایانی شەرعزانی مەزهەبی حەنبەلی رحمه الله (٢٥)

---

٢٤ فتاوی في حکم شرب الدخان للشیخ محمد إبراهیم آل الشیخ رحمه الله. ص ٧-٨-٩

٢٥ هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٠-١١

٢-الشيخ عبدالله بن الشيخ محمد إبن عبدالوهاب رحمهم الله تعالى: (...وبما ذكرنا من كلام رسول الله صلى الله عليه وسلم وكلام أهل العلم يتبين لك تحريم التتن الذي كثر في هذا الزمان استعماله ... فلا ينبغي لمن يؤمن بالله واليوم الآخر أن يلتفت إلى قول أحد من الناس إذا تبين له كلام الله وكلام رسوله في مثله من المسائل؛ وذلك لأن الشهادة بأنه رسول الله تقتضي :طاعته فيما أمر ، والانتهاء عما عنه نهى وزجر ، وتصديقه فيما أخبر).

**واته:(...ئەوەی کەباسمان کردلەوتەی پێغەمبەرﷺوەوتەی زانایان بۆت ڕوون ئەبێتەوەکەحەرامە توتن کەلەم سەردەمەدا زۆر بەکار ئەهێنرێت ....دروست نییە بۆکەسێك باوەڕی بە خواو بەڕۆژی دوای هەبێت کەئاوڕبداتەوەبۆقسەی هیچ کەسێك لەخەڵکی لەکاتێکدا کەبۆی ڕون بوەوە ووتەی خواو پێغەمبەرەکەیﷺلەوێنەی ئەم جۆرە باسانەدا ئەویش لەبەرئەوەی شایەتی دان بەوەی کەمحمدﷺپێغەمبەری خوایە وا ئە خوازرێت کە:گوێڕایەڵی بکرێت لەفەرمانەکانیدا وەوازهێنان لەوشتانەی کەنەهی لێکردووە،وەبەڕاست زانینی ئەوشتانەی کەهەواڵی پێداوە).**

٣- **لە زاناو شەرع زانانی مەزهەبی شافعی** رحمه الله: الشيخ الشهير بالنجم الغزي الشافعي قال ما نصه: والتوتون الذي حدث وكان حدوثه بدمشق سنة خمس عشرة بعد الألف يدعي شاربه أنه لا يسكر، وإن سلم له فإنه مفتر وهوحرام ... .

واتــــه:(ئەوتوتنــــەی کەدەرکــەوت دەرکەوتنەکەشــــی لەدیمەشـــق سـاڵی١٠١٥پڕوپاگەنـدەی ئەوەنـەکرا کەئـەو کەسـەی بیکێـشێت بـێ هۆشـی ناکـات ئەگـەر واش بێـت _واتـە ئەگـەر بێهۆشـی نـەکات _ئەوەبێگومان بەفیڕۆدانی ماڵە_لەکارێکی بێسوددا_وەئەوەش حەرامە)..

٤- وەله زانایان و شەرع زانانی مەزهەبی مالیکی رحمه الله : کەبـە حـەرامیان زانیـوە الشیخ خالد بن أحمد وشیخ إبراهیم اللقاني رحمهم الله تعالی. (٢٦)

٥- الشیخ محمد بن مانع رحمـــه الله : قـــال في حاشـــیة علـــی غایـــة المنتهی:/٢/٣٣٢ ( إن القول بإباحة الدخان ضرب من هذیان فلایعـــول علیه الأنسان ، لضرره الملموس، وتضیره من المحسوس، ورائیحته کریهـــة وبذل المال فیما لا فائدة فیه، فلا تغتر باقوال المبیحین، فکل یأخذ من قوله ویرد إلا رسول الله ﷺ ).

واته:(ئەوقسەیەی کەدەربارەی حەڵاڵێتی جگەرە ئەوترێت جۆرێکـە لـەتێك چونی عەقڵ ومرۆڤ مەیلی بۆلای ناڕوات لەبەرهـەبوونی زەرەرێکـی بەرچـاو وەزەرەرلێکەوتنێکی هەست پێکـراو وەبـۆنێکی پـیس وەبـەفیڕۆدانی ماڵـە لەشتێکدا کەبێ سودە هەڵمەخەڵـەتێ بەووتـەی ئەوانـەی کەئـەڵێن حەڵاڵـە چـونکە هەمووکەسـێك قسەیـشی لـێ وەر دەگیرێـت و ووتەیـشی ڕەت ئەکرێتەوە تەنها پێغەمبەری خوانەبێت ﷺ)

٢٦ هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٢

٦- الامام المفسر عبدالرحمن بن ناصر السعدي رحمه الله:

أما الدخان شربه والإتجار به ، والإعانة على ذلك حرام ، لا يحل لمسلم تعاطيه شربا ، واستعمالا ، واتجارا ، وعلى من كان يتعاطاه أن يتوب إلى الله توبة نصوحا ، كما يجب عليه التوبة من جميع الذنوب ، وذلك أنه داخل في عموم النصوص الدالة على التحريم ، داخل في لفظها العام وفي معناها ، وذلك لمضاره الدينية والبدنية والمالية ، التي يكفي بعضها في الحكم بالتحريم : فكيف إذا اجتمعت ؟!(٢٧)

**واته:جگەره هەم كێشانی حەرامە وهەم بازرگانی پێوەكردنی وهەم هاوكاری كردنی لەسەر ئەوانە حەرامە حەلاڵ نییە بۆموسوڵمان بەخشینی وەك كێشانی وەبەكارهێنانی وەبازرگانی پێوەكردنی وەئەوكەسەی كەبەوشێوەیە مامەڵەلەگەڵ جگەرەدائەكات پێویستە لەسەری تەوبەبكات بەتەوبەیەكی ڕاست _كەنەگەڕێتەوە سەری _هەروەكوچۆن پێویستە لەسەری تەوبەبكات لەسەر هەمووگوناهەكانی تری لەبەرئەوەی ،ئەگەرجگەرەكێشان داخڵ دەبێتە ناو دەقەگشتی یەكانەوە كەبەڵگەن لەسەر حەرامێتی یەكەی ،وەدەچنەلەفزەگشتی یەكانەوە لەماناشدا ئەویش لەبەر ئەوزیانەئاینی ولاشەیی ومالّیانەوەیە كەهەندێكیان بەسن لەحوكمدا بۆحەرامێتی ،ئەی چۆنە ئەگەر هەموو بەڵگەكان كۆببنەوە لەسەری ؟**

٢٧ حكم الشرب الدخان فتوى العلامة عبدالرحمن بن ناصر السعدي ص١٣ بتقديم فضيلة الشيخ عبد الرزاق عفيفي.

٧- السماحة الشيخ العلامة محمد بن إبراهيم آل الشيخ رحمه الله قال: لا ريب في خبث الدخان ونتنه ، وإسكاره أحيانا وتفتيره . وتحريمه بالنقل الصحيح ، والعقل الصريح ، وكلام الأطباء المعتبرين ... .(٢٨)

**واته:(هيچ گومان نييه لەپيسێتی وبۆگەنی جگەرەدا وەعەقڵ لابەرە هەندێك جار وەبەفیرۆدەرە وەحەرامیشە بەبەڵگەی نەقڵی صەحیح و وەبەڵگەی عەقڵی ڕاستەوخۆ ووەقسەی دکتۆرە باوەڕپێکراوەکان)**

٨- فتوى سماحة الشيخ العلامة الامام عبدالعزيز بن عبدالله بن باز رحمه الله:
قد دلَّت الأدلةُ الشرعية على أنَّ شرْب الدخان من الأمور المحرَّمة شرعًا؛ وذلك لِمَا اشتمل عليه من الخُبث والأضرار الكثيرة، والله - سبحانه - لم يُبحْ لعباده من المطاعم والمشارب إلاَّ ما كان طيِّبًا نافعًا، أمَّا ما كان ضارًّا لهم في دِينهم أو دنياهم، أو مُغيِّبًا لعقولهم، فإنَّ الله - سبحانه وتعالى - قد حرَّمه عليهم، وهو - عزَّ وجلَّ - أرحمُ بهم من أنفسهم، وهو الحكيمُ العليم في أقواله وأفعاله، وشَرْعه وقَدَرِه، فلا يُحرِّم شيئًا عبثًا، ولا يخلق شيئًا باطلاً، ولا يأمر بشيء ليس للعباد فيه فائدة؛ لأنَّه - سبحانه - أحكم الحاكمين، وهو العالِم بما يُصلح العبادَ، وينفعهم في العاجل والآجل(٢٩)

**واته:(بێگومان بەڵگە شەرعیەکان لەسەرئەوەن کەجگەرەلەشتەحەرامەکانە بەپێی شەرع _ئەویش لەبەر ئەوەی کە جگەرە-پێکهاتووە و پڕیەتی -لەپیسی وەچەندین زیانی زۆری**

٢٨ فتوى في حكم شرب الدخان للشيخ محمد إبراهيم آل الشيخ رحمه الله. ص ٥

٢٩ حكم شرب الدخان وامامة من يتجاهر بشربه ابن باز ص ١-٢

هەیـە، وەخـوای گـەورە حـەلاَلّی نـەکردووە بۆبەنـدەکانی لـەخواردن وخواردنەوەدا تەنها ئەوانە نەبێت کەپاك وسودمەندن بـەلاّم ئەوانـەی کەزەرەر مەندن بۆبەندەکان بۆدین ودونیایان یـان عـەقلّیان ئـەبات — وەك عارەق کـەمرۆڤ بـێ عـەقلّ دەکـات ودەیباتـەڕیزی ئاژاڵانـەوە — ئەوەخوای گەورە حەرامی کردووە لەسەریان ،خوای گەورە بەبـەزەی تـرە بۆبەنـدەکانی لـەخۆیان– زیـاتر– ئەوخوایـە دانـاو زانایـە لەقـسەوکردەوەکانیدا وەلەشـەرع وقەدەرەکانیـدا —ئەنـدازەکانی — جاشـتێکی حـەرام نەکردووەبەهەوانتـە ،وەهـیچ شـتێکی دروسـت نەکردووە باتـلّ بێـت ،وەفـەرمانی نەکردووەبەشـتێك کەبێـسود بێـت بۆبەنـدەکانی ،لەبەرئـەوەی خـوای گـەورە دادوەرتـرین دادوەرەو ئەوزانایە بەشتێك کەبگونجێ وچـاك بێـت بۆبەنـدەکانی وەسـودی لـێ ببینن لەئێستاو داهاتویشدا).....

هەروەها پرسیاری لێکرا کـە ئایـا جگـەرە کـێش دروسـتە نوێـژی لـە دواوەبکرێت ؟(٣٠) ئەویش لە وەلاّمـدا دەفـەرموێت : أمَّا إمامة شارِب الدُّخَان وغيره من العُصاة في الصلاة، فلا ينبغي أن يُتَّخذ مثله إمامًا؛ بـــل المشروع أن يُختارَ للإمامة الأخيارُ مـــن المـــسلمين المعـــروفين بالـــدِّين والاستقامة؛ لأنَّ الإمامة شأنها عظيم .

٣٠ سەرچاوەی پێشوو لا ٣-٤-٥

**هەروەها** شێخ ابن باز رحمه الله **دەفەرموێت:** فقال بعضهم: (أي العلماء) لا تصح الصلاة خلفَه؛ لضعفِ دِينه، ونقص إيمانه، وقال آخرون من أهل العلم: تصحُّ إمامته والصلاة خلفه؛ لأنه مسلم قد صحَّت صلاتُه في نفسه، فتصح صلاة مَن خلفه؛ ولأنَّ كثيرًا من الصحابة صلَّوْا خلف بعض الأمراء المعروفين بالظلم والفسق، ومنهم ابن عمر - رضي الله عنهما - قد صلَّى خلف الحجَّاج، وهو مِن أظلم الناس.

وهذا هو القول الراجح، وهو صحّة إمامته، والصلاة خلفَه؛ لكن لا ينبغي أن يُتَّخذ إمامًا مع القدرة على إمامة غيره من أهل الخير والصلاح...

مفتي عام المملكة

ورئيس هيئة كبار العلماء وادارة البحوث العلمية والافتاء

عبد العزيز بن عبدالله بن باز

**واتە:ئەوەی کەئیمامەتی نوێژەجگەرەکێشەوەجگەلەوتاوان کارانە نابێت نمونەی ئەوانەبکرێتەئیمام ،بەڵکوئەوەشەرعیەکەکەسانی هەڵبژاردەوچاك لەناو موسوڵماناندا هەڵبژێردرێن بۆئیمامەت کەناسراون بەدیندار و بەردەوام بون لەسەری ،چونکە پلەوپایەی ئیمامەت کردن زۆربەرزە..**

**هەروەهاشێخ إبن باز دەفەرموێت :هەندێك لەزانایان فەرموویانەهەردروست نیە نوێژی لەدولوەبکرێت لەبەرلاوازی دینی وکەم وکورتی باوەڕی ،وەهەندێکی ترلەزانایان فەرمووڕیانە:دروستەئیمامەتی جگەرەکێش ونوێژکردن**

لەدوایەوەچونکە موسوڵمانە ونوێژەکەی خۆی دروستە کەواتەنوێژی ئەوکەسەش دروستە کەلەدوایەوەنوێژ ئەکات وەلەبەرئەوەش کەزۆرینەی هاوەڵان -ڕەزای خوایان لێبێت-نوێژیان کردووەلەدوای هەندێك لەوکاربەدەستانەی کەناسراون بەستەم کردن ودەرچون -فیسق- لەوهاوەڵانە إبن عمر-ڕەزای خوای لێبێت-کەنوێژی لەدوای حەجاجەوە کردووە کەحەجاج ستەم کارترین کەس بووە،لەسەردەمی خۆیدا کەئەوە-وتەی تەواوە- راجحە-کەجگەرەکێش ئیمامەتی ونوێژکردن لەدوایشییەوە هەردروستە بەڵام نابێت بکرێتە ئیمام لەگەڵ توانابون بەئیمامەتی ئیمامێکی تر کەئەهلی خەیرو چاکەبێت ...

٩- فتوى سماحة الشيخ الفقيه المفسر محمد بن صالح العثيمين رحمه الله:( ... أما تحريم التدخين فأنه من قرأ ما كتبه العلماء وقرره الاطباء عنه لم يشك في أنه حرام، وهو الذي نراه ونفتي به)(٣١).وقا أيضاً(ومما لايجوز بذل المال فية،أن يبذله في محرم،كهؤلاءالذين يشترون الدخان بالمال،فإن هذا حرام ،وهومما نهى الله عنه،لأنه إضاعةواضحةللمال،فكيف يبذل الإنسان ماله في شيء يحرقه،لأن الدخان لايشرب إلا إذا إحرق،فكأنما الرجل أحرق الدراهم وأتلفها في أمريضره أيضاً،وليته يسلم من ضرره ،ولهذااتفق الأطباء الآن على أنه ضارللصحة،وأنه يجب على الإنسان أن يتجنبه ،حتى الدول

[31] مجموعة فتاوى ورسائل محمد بن صالح العثيمين ج١١/ص ٢٠٦-٢٠٧/الحلال والحرام في الاسلام لابن عثيمين ص١٥٢-١٩٧-١٩٨ لە پێشدا باسی تەفسیری ئایەتی ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾مانکرد کە شێخ کردویەتی بەبەڵگە بۆ حەرامکردنی جگەرە بۆیە لێرەدا دووبارەی ناکەینە، بروانە تفسیر سورة البقرة لابن عثيمين ج٢/ض٣٩٠

الكفارةالآن المتقدمة صناعياً يمنعون الدخان منعًا قاطعًا أن يشرب في المجـــالس العامة،وأمافي المجالس الخاصةفممنوع أيضًا،إلاإذااستأذنوا أهل المجلـــس فـــأذنوا وإلافيمنع،لأنه ضارللمدخن وللحاضر،حتى إنهم يمنعون من شرب الدخان فوق الأجواء،كما حدثني قواد الطائرات أنهم إذادخلوحدود بعض البلادالكـافـرة امتنع ركاب الطـــائرة عـــن التـــدخين لامـــن أجـــل الـــدين،لكـــن لأنـــه مضر،واحترامًالأجوائهم،فياأسفا أن يكون هذامن الكفار،وأما من المسلمين اليوم فلاتجدالرجل يبالي بالناس،يخرج السيجارة ويدخنها ولا يبالي بأحد.وهذا حرام عليه أولاً-لنفسه —والثاني-لأذية المسلمين ،فالنا س يتأذون بهذا وقد قال تعالى:{والذين يؤذون المؤمنين والمؤمنتِ بغيرما آكتسبُوافقد آحتملُواْ بهتناً وإثماً مبينًا}(الأحزاب:٥٨)فهويؤذيهم ،والدخان الذى يكون بينـــهم يـــدخل أيـــضًا إلى أجوافهم ويتضرون به .فيحرم على الأنسان أن يشتري شيئًا من الدخان وهوإن فعل ذلك فهو آثم ومصرعلى معصيته وتصقط عدالته بذلك وترفع ولايته عمن له ولاية عايه-كماقال كثير من العلماء-لأنه خرج عن العدالـــة إلى الفـــسق ،والفاسق لاولايةله في عقد النكاح —مثلاً-فا لمسألة خطـــيرة)... (شـــرح ريـــاض الصالحين/لفضيلة الشيخ محمدبن صالح العثيمين/ج٦/ص٥٥٠+٥٥١)

**واتـــه:(ئـــەوەی كـــەدەربارەی حـــەرامێتی جگـــەرە كێـشانە بێگومـــان هەركەسێك ئـــەوەی خوێندبێتـــەوە كـــەزانایان نوسـیویانە ودكتۆرەكـان بڕیاریان داوە لەسەری ئەوا هیچ گومانی لەحـەرامێتی جگەرەكێـشان نامێنێ ،هەروەهاش دەبینین وفەتواش لەسەری ئەدەین .(واتەلەسـەر حەرامێتی).....**

وەهەروەهادەفەرموێت:وەلەوشتانەی کەماڵ بەخشین تێیدا دروست نیە بەخشینی ماڵە لەحەرامدا هەروەکوئەوانەی کەجگەرەئەکڕن بەپارە بێگومان ئەوەحەرامە وە ئەوەیە کەخوا نەهی لێکردووە چونکە بەفیڕۆدانێکی ئاشکرای ماڵە دەی چۆن مرۆڤ ماڵەکەی ئەبەخشێت لەشتێکدا کەئەی سوتێنێ،چونکە جگەرە ناکێشرێت ئیلائەبێ بسوتێنرێت ،هەروەکو چۆن پیاوپارەکەی بسوتێنێ وبیفەوتێنێ لەکارێکدا لەویشیان زیانیشی لێ ئەدا ،خۆزگە هەرپارەسوتاندنەکەبوایە و خۆی سەلامەت بوایە لەزیانەکەی — واتە:وەك زیان لەماڵی دەدات هەرئەو زیانە نیە بەتەنها بەڵکو زیان لەلاشەیشی ئەدات —هەرلەبەرئەوەیشە ئێستا دکتۆرەکان کۆدەنگن لەسەر زیانی جگەرە بۆلەشی ساغ وەپێویستە مرۆڤ لێی دووركەوێتەوە،تەنانەت وولاتەبێباوەڕەپێشکەوتووەکانیش لەڕوی پیشەسازیەوە ئێستا جگەرە کێشانیان قەدەغەکردووە قەدەغەکردنێکی یەکجاری وبنەبڕکەنەکێشرێت لەشوێنە گشتییەکاندا وەهەروەها لەشوێنەتایبەتییەکانیشدا قەدەغەیە مەگەرداوای ڕووخسەت وئیزن لەکەسانی مەجلیسەکە بکات وئەوانیش ئیزنی بدەن ئەگینا قەدەغەئەکرێ ،چونکە جگەرە زیان بەخشە بۆئەو کەسەی کەئەیکێشێ وئەوەیشی کەلەوشوێنەدا بێت ،تەنانەت جگەرەکێشانیشیان قەدەغەکردووە لەئاسمانیشدا هەروەك چۆن فڕۆکەوانێکی فڕۆکە بۆی باسکردم کەکاتێك دەگەنەسەر ئاسمانی

هەنـــدێك لەووڵاتـــەبێ باوەڕەكـــان وئەچـــنە ســـنوری ئاسمانیـــان سەرنـــشینانی فڕۆكەكـــە قەدەغەئـــەكرێن لەجگەرەكێـــشان ،نـــەك لەبـەرخاتری دیـن بـەڵكو لەبـەر ئـەوەی زیـان بەخـشە وەڕێزگرتنێكـە بۆئـاو و هـەوایان ،جابەداخـەوە ئەوەلـەناو كافرەكانـدا یـە !!!بـەڵام لەناوموسـوڵمانانی ئـەمڕۆداپیاوێك نـا بینـی گـوێ بەخـەڵكی بـدات جگەرەدەرئـەهێنێت وئەیكێـشێ وگـوێ بەكـەس نـادات كەئـەوە– یەكـەم:حەرامـەبۆی –دووەم :ئـازاردانی موسـوڵمانانە،كەخـەڵكی بەوەئازارئەدرێن ،خوای گەورەفەرموویەتی﴿والذين يـؤذون الـمؤمنين والمؤمنت بغير ماأكتسبوا فقد احتملوا بهتناوإثما مبينا﴾الأحزاب–٥٨

واتە:(ئەوانەش كەئازاری پیاوانی ئیمان دار و ژنانی بڕوادارئەدەن بێ هیچ تاوانێك كردبێتیـان بێگومـان ئەوانـە درۆ و بوختـان وگونـاهی ئاشـكرایان هەڵگرتووە).

كەئـــەوەئازاریان ئـــەدات وەئەودوكەڵەشـــی كەلەنێوانیاندایـــە جـــارێكی تـــر ئەچێتەوەناوسـیەكانیانەوەوزیان مەندئـەبن لێـی ،جاحەرامەلەسـەرمرۆڤ كرینـی شـتێك لەدوكـەڵ–جگـەرە–ئەگەركەسـێك ئـەوكارەی كـرد ئـەوەتاوان بـارەو بەردەوامەلەسەرتاوان وسەرپێـچی و سـەرەنجام بـەوە–بەجگەرەكێشانەكەی و وازلـێ نـەهێنانی –عەدالـەتی لەدەسـت دەدات و ویلایـەتی–سەرپەرشـتی – هەڵئەگرێ لەسەرئەوكەسەی كەسەرپەرشتی كەسانی تر ئەكات هـەروەكو چۆن زۆریەی زانایان فەرموویانە لەبەرئەوەی ئەوكەسەلەعەدالەتەوەدەرئەچێ بـەرەو فاسق بوون وەفاسقیش ویلایەتی–سەرپەرشتاری– بۆنیە ،لەبەشودان بۆنمونـە دەی باسەكە ترسناكە).

١٠- الشيخ محمد الحامد رحمه الله: قال: ( وقد ناديت بتحريمه – أي الدخان- على المنبر من زمان بعيد)(٣٢).

**واته:(هەر لەدێر زەمانەوە هاوارم كردووەلەسەرمینبەرەوە كەجگەرەكێشان حەرامە)..**

١١- قال الشيخ سعدندا حفظه الله: (... وبعض الناس يفتون بكراهية الدخان، ولكنه فبما يبدولي أنه حرام للأدلة الأتية...)(٣٣).

**واته:وەهەندێك لەخەڵكی فەتوائەدەن بەكەراهەتی جگەرەكێشان بەڵام ئەوەی كەدەركەوتووەلام ئەوەیە كەحەرامەبەم بەڵگانەی كەدێت...-لەپێشدائاماژەمان پێدان-)**

١٢- الشيخ سيد سابق رحمه الله: ( يقول بتحريم الدخان لقول رسول الله " لا ضرر ، و لا ضرار ")(٣٤).

**واته:(شێخ سیدسابق دەفەرموێت كەجگەرەكێشان حەرامە چونكە پێغەمبەری خواﷺدەفەرموێت -نەزیان لەخۆتان بدەن نەلەخەڵك-)**

١٣- الشيخ محمد حسن الدريعي – استاذ بالكلية المتوسطة بالرياض: ( **أن القول بالتحريم أولى لشيوع أضراره ولأنه من الخبائث ولايوجد الوسط بين الطيبات والخبائث)(٣٥).**

---

[٣٢] تحقيق البرهان في شأن الدخان الذي يشربه الناس الآن /ص ٧٥ قال اللجنة الدائمة: (الدخان مادة خبيثة مضرة لا يجوز شربه ولا يجوز بيعه لأن الله إذا حرم شئاً حرم ثمنه ) رقم الفتوى/١٦٥٠٤

[٣٣] تحقيق البرهان في شأن الدخان الذي يشربه النـاس الآن / ص ٧٩ بەڵگە كانیمان نەنوسیوین چونكە هەر ئەو بەڵگانەن كە لە پێشدا ئاماژەمان پێكردووە، وە پێویست ناكات دووبارەی بكەینەوە.

[٣٤] موسوعة الفقه الاسلامي المعاصر / د. عبدالحليم عويس ج٣/ص٥٦٥

**واته:(قسەلەسەرحەرامێتی جگەرەکێشان ئەولاترەو نزیکترە لەبەربڵاوی زیانەکانی وەلەبەرئەوەش کەلەپیسەکانەوەنابینرێت ناوەندێك لەنێوان پاکەکان وپیسەکاندا).**

١٤- مؤلف كتاب (موسوعة الفقه الاسلامي المعاصر) د. عويس عبدالحليم قال: (فلقول رسول الله " لا ضرر ، و لا ضرار " ويدخل في هذا الباب الدخان فإنه ضار لصحة وفيه التبذير وضياع للمال )(٣٦).

**واته:(جالەبەر فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەفەرموویەتی نەزیان لەخۆت بدەونەلەخەڵکیش وەجگەرەکێشانیش ئەچێتەناوئەم بابەتەوە کەزیان بەخشە بۆلەشی ساغ وبەفیڕۆدانی پارەیشە)..**

١٥- الشيخ عمر بن أحمد المصري الحنفي قال: ( الدخان خبيث ثبت حرمته عند كثير من العلماء ...)(٣٧).

**واتە:(جگەرەکێشان پیسەوحەرامێتیەکەشی لای زۆربەی زانایان جێگیربووە-واتە،گومانیان لەحەرامێتی نەماوە).**

١٦- سئل الشيخ عبدالله بن عبدالرحمن أبوبطين رحمه الله عن التدخين قال: ( إنا نرى فيه التحريم).

**واتە:پرسیار کرالەشێخ عبدالله عبدالرحمن أبوبطين دەربارەی جگەرەکێشان :فەرمووی ،ئێمەوای ئەبینین کەحەرامە).**

١٧- و سئل الشيخ محمد بن ناصر بن معمر رحمه الله عن التتن، فأجاب أنه حرام...

---

[٣٥] موسوعة الفقه الاسلامي المعاصر/ج٣ص٥٦٦

[٣٦] موسوعة الفقه الاسلامي المعاصر/ج٣ص٥٦٥

[٣٧] الدلائل الواضحات على تحريم المسكرات المفترات لفضيلة الشيخ حمود بن عبدالله التويجري ص/ ١٦٩

**واته:(پرسیارکرا له شیخ محمد بن ناصر بن معمر دەربارەی توتن ،ئەویش وەلامی دایەوەکەبێگومان حەرامە).**

١٨- فتوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والافتاء: ( يحرم بيع الدخان لخبثه واضراره الكثيرة وفاعل ذلك يعد فاسقا ...) (٣٨).

**واته:(لەفەتوای- اللجنة الدائمة-داهاتووەدەفەرمووێت :حەرامەکڕین وفرۆشتنی -مامەڵەی-جگەرەلەبەر پیسێتی وزیانەزۆرەکەی وەهەرکەس ئەونیشە بکات بەفاسق ئەژمێردرێت).**

١٩-الشيخ أبي عبيدةمشهوربن حسن آل سلمان حفظه الله:{تعاطي الدخان من الخوارم لأنه حرام.....}المروءةوخوارمها-ص١٤٣

**واته:(بەخشینی جگەرە-واتەجگەرەبدەی بەکەسێکی تر-ئەوەلەڕوشێنەرەکانی پیاوەتین-مروئەت ئەڕوشێنێت-).**

٢٠-الشيخ وحيدعبدالسلام بالي حفظه الله :{التدخين محرم لأنه من الخبا ئث وقدحرم الله الخبائث،ولأنه مضربا لصحه وقد نها النبيﷺ عن الأضراربا لنفس أو با لغير فقالﷺلاضرولاضرار.ولأن فيه أسرافا وتبذيرا وعن هنا لايجوز للمسلم أن يقترف هذا المحرم فيه أي مكان ....}كلمات النافعة في الأخطاء الشائعة-ص٢٤٧-٢٤٨

**واته:(جگەرەکێشان حەرامە لەبەر ئەوەی لە پیسەکانەو خوای گەورە پیسەکانی حەرام کردووە،وەلەبەر ئەوەی زیان بەخشە بۆلەش ساغی وپێغەمبەرﷺنەهی کردووەلەزیان گەیاندن بەنەفسی خۆیان وبەکەسانی تر**

[38] فتوى رقم/ ٨٩٨٢/ عبدالله بن قعود/ عضو، عبدالله بن غديان/عضو، عبدالرزاق عفيفي/ نائب الرئيس، عبدالعزيز بن باز/ الرئيس.

وەك ئەفــەرموویێت: (لاضرولاضـــــــرار) وەلەبــەر ئــەوەی زیــادەڕەوی وبەفیڕۆدانی ماڵە وەبۆیە لێرەدا دروست نیە بۆهیچ موسـوڵمانێك کـەنزیك ببێتـەوە یـان تێکـەڵی ئەوەحەرامـە ببێـت لەهەرکوێیـەك بێـت –وەنابێـت کاسپی پێوەبکات–).

٢١-قـــال الـــشيخ أحمـــدبادويلان: (تنـــها نـــا الـــسنةالمطهرةعن كـــل مسكرومفتركماتنهاناعن إضاعة المال فيمالاجدرا منه ولاطائـــل مـــن ورائـــه رحمةبناوإحساناًإلينا ،وقد أفتى العلماء بتحريم شرب الدخان وذلك نظراًكما فيه من أضراردينية ودونيوية وإجتماعية وصحية، لهذاالتدخين من الخبائـــث الـــتي يحرمها القرآن)

وهكذا أطفأت السجارة---ص١٣

الأخيرةتجربةواقعيةناجحة للتخلص من التدخين

لجنةمكافحةالتدخين بالمدينةالمنورة/أحمدبادويلان

واتە:(سوننەتەپاك وجوانەکان نەهی لێ کردووین لەهـەموو ئـەقڵ لابـەرێك وماڵ بەفیڕۆدەرێك هەروەکو چـۆن نـەهی لـێ کـردووین لەبـەفیڕۆدانی مـاڵ لەشتێکدا کەشایانی نیەو هیچ سودێکی بەدواوەنیە وەك ڕەحمەتێك بۆمان و چاکەیەك لەگەڵمان وەزانایـانیش فـەتوای حـەرامێتی جگـەرە کێشانیان داوەئـەویش لەووردبوونـەوەیان کەچـۆن تێیدایـە زیـانی دینـی و دوونیـای وکۆمەڵایەتی ولـەش سـاغی لەبـەر ئـەوە جگەرەلـەو پیسانەیە کـەقورئان حەرامی کردووە)..

٢٢-قال الشيخ الدكتور غازي عبداللطيف موسى:(نحن جميعاًنعلم أن التبغ لم يكن موجوداًفي زمن الرسولﷺ ولكننانعلم أيضاًبأن تعاليم الأسلام جاءت بأصول عامةوضوابط وقواعد تحرم كُل ماهومهلك ،ضاربالجسم والنفس أو بالعقـــل

أوبالمال أوبالنسل أو بالدين ....،وأخيراًفإن للتدخين أشراًضاراًعلى دين المدخين المسلم وحسن التزامه بأحكام الأسلام والتأدب بآدابهِ..أن التـــدخين حـــرام بلاشك...)

التدخين بين الطب والدين /ص٥٨-٦٣-٦٦

تأليف الدكتور غازي عبداللطيف موسى

بكالوُريوس طب وَجرحةعضو كليةأطباء الصدرالباكستانية، زميل كليةأطباء الصدرالأمريكية

**واتـــه:(ئێمەهـــەمووومان دەزانـــین کەئـــەم –گەلاتوتنـــە–نەبووەلەســـەردەمی پێغەمبەردا ﷺبەلآم ئەزانین کەزانستی ئیسلامی بەکۆمـەڵێك بنـەمای گشتی و ڕێکخەرو بنچینەوە هاتووە ،وەهەرشتێکیش کەزیان بەخش بێت بۆلەش ونەفس و عەقلّ ومالّ و وەچـەو دیـن ....،لەکۆتایـدابێگومان جگـەرە خـراپترین وزیـان بەخش ترین شـتە لەسـەردین ی موسـوڵمان ی جگـەرەکێش و وەچـاك پابەنـد نـــەبوونی بەئەحکامـــەکانی ئیـــسلامەوە وخوڕەوشـــت جـــوانکردن بەڕەوشتەکانیەوە....بێگومان جگەرەکێشان حەرامە).**

**خوێنەری بەڕێز موسوڵمانی خۆشەویست ئەمە هەندێك لە فـەتوای زانایـان بوو لە بارەی جگەرەو حوکمی کێشانیەوە، وە کۆمەڵێکی زۆری تـریش لـە زانایـان حـــەرامیان کـردووە جـا لەبـــەر ئـــەوەی زۆر درێـــژە نەکێـشێت فەتواکانیاندان نەهێناوە بەلآم ئاماژە دەکەین بەناوی هەندێك لەو زانایانە، وە زۆریەی زۆری ئەو زانایانە کتێبیان لەسەر حەرامێتی جگـەرە نویسوە ، ئێمە لێرەدا ناوی ئەو کتێبانە نانوسین ، دەتوانیت بۆ زانـینی نـاوی ئـەو کتێبانە بگەڕێیتەوە بـۆ کتـێبی (تحقيق البرهـــان في شـــأن الـــدخان). لـەو زانایانەش:**

١- العلامة الشيخ عمر مفتي عنيتاب

٢- الشيخ محمد محمد المرعشي

٣- الشيخ عبد الغني بن اسماعيل النابلسي

٤- الشيخ محمد بن علي الجمالي المغربي المالكي الازهري

٥- الشيخ محمد الصادق

٦- الشيخ أبراهيم الواعظ

٧- الشيخ محمد بن علي بن علان الصديقي المكي الشافعي

٨- الشيخ عبد القادر الراشدي

٩- الشيخ عيسى الشهاوي

١٠- الشيخ محمد بن محمد المالكي التافلاني

**ئەم زانایانەو کۆمەڵێکی تریش کتێبیان نوسیوە لەسە حوکمی حەرامێتی جگەرە، کە زیاترلە (١٠٠) زانا دەبن کە نوسراویان هەیە لەوبارەیەوە.وە ئەم زانایانەی خوارەوەش کە لە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا و لەکات وسەردەمی جیاوازدا ژیاون فەتوایان داوە لەسەر حەرامێتی جگەرە کێشان بەپشت بەستن بەو بەڵگە شەرعیانە﴿کەباس کرا﴾**

١- الشيخ أحمد السهنوي البهوتي الحنبلي – من علماء المصر

٢- أبوالغيث القشاش المالكي – من علماء المغرب

٣- إبراهيم بن جمعان وتلميذه أبوبكر الأهدل – من علماء اليمن

٤- المحقق عبدالملك العصامي وتلميذه محمد بن علان و عمر البصري – من علماء الحرمين

٥- الشيخ محمد الخواجة و عيسى الشهادي الحنفي – من علماء الروم

٦- السيد سعد البلخي والمدني

٧- محمد البرزنجي المدني الشافعي

٨- الشيخ العالم عبد الحي الكنوي **كه زۆر توندوتیژ بووه لەسە حەرامێتی جگەره**

٩- الشيخ الدكتور عبدالعزيز الخياط

١٠- الامام الحافظ ابويعلى محمد عبدالرحمن المباركفوري

١١- المحدث الكبير الشيخ بدرالدين الحسيني الديمشقي

١٢- الشيخ هاشم الخطيبي

١٣- الشيخ الدقر

١٤- الشيخ صالح الفوزان

١٥- الإمام الالباني

١٦- الشيخ حمود التويجري

١٧- الشيخ عبدالله بن عبدالرحمن الجبرين

١٨- الشيخ ابوبكر جابر الجزائري

١٩- الشيخ بكر أبوزيد

٢٠- عبدالله بن غديان

٢١- عبدالله بن منيع

٢٢- الشيخ عبدالرزاق عفيفي

٢٣- عبدالله بن قعود

٢٤- الشيخ المحدث الإمام مقبل بن هادي الوادعي

٢٥- الشيخ ربيع بن هادي المدخلي

٢٦- الشيخ علي حسن الحلبي

٢٧-الشيخ العلامة نوح أفندي بن مصطفى الرومى الحنفي

٢٨-الشيخ العلامةمحمدبن على الجمالى المغربى المالكى الأزهري

٢٩-الشيخ العلامةعبدالمالك بن جمال العصامي إبن صـــدرالدين عـــصام الـــدين الإسفرايني المالكى.

٣٠-الشيخ عثمان بن محمدالخميس

٣١-الشيخ العلامةناصرالدين إبراهيم بن إبراهيم بن حسن اللقاني المالكى

٣٢-الشيخ ترحيب بن ربيحان الدوسريّ .

٣٣-الشيخ العلامة نورالدين على بن محمد عبدالرحمن الأصبهورى المالكى

٣٤-الشيخ العلامة سليمان بن محمد ابن محمد بن إبراهيم الفلانى المالكى

٣٥-الشيخ خالدبن الحريف

٣٦-الشيخ أحمد بن عبدالعزيز الشرفي السفاقسي المالكى

٣٧-الشيخ أبي عبدالله محمدبن سعيدرسلان

٣٨-الشيخ محمدبن سلمان المالكى

٣٩-الشيخ محمدبن حمزةالكوز لحصارى الحنفي

٤٠-الشيخ محمدبن عبدالله الطرابيشي الحنفي الشهير بالمستوقي

٤١-الشيخ إبراهيم الواعيظ

٤٢-الشيخ حسين بن إسكندر

٤٣-الشيخ عبدالقادر الاشدي

٤٤-الشيخ خالد المكى مفتي مكة

٤٥-الشيخ عبدالكبير بن محمد عبدالواحد الكتانى

٤٦-الشيخ أحمد بابا السودانى

٤٧-الشيخ عبدالكريم بن محمد بن عبدالكريم بن قاسم بن يحيى الفكـــون القسصنطيني

٤٨-الشيخ محمدالسوسي المغريبي

٤٩-الشيخ محمدبن المالكى التافلاتي

٥٠-الشيخ العلامةأبي زيدعبدالرحمن بن أحمد الكتامي الـــشاوي نـــسباً المالكى مذهباً

٥١-الشيخ العلامةالسيديحيى بن أحمد بن محمدالعشرفي اليمني

٥٢-الشيخ العلامةمحمودبن محمد بن أحمدبن خطاب السبكى الأزهري المالكى

٥٣-الشيخ سيد بن سعد الدين الغباشي

٥٤-الشيخ محمدبن سعيد الشويحر

٥٥-الشيخ محمدبن عمر بن سالم بازمول

٥٦-الشيخ أبي إبراهيم محمدبن عبدالوهاب الوصابي

٥٧-الشيخ العلامةأحمدبن يحيى النجمي

٥٨-الشيخ عبدالسلام بن برجس العبدالكريم

٥٩-الشيخ عبدالله بن حسين المخضوب

٦٠-الشيخ عوادبن عبدالله المعتق

٦١-الشيخ أبي البراءعلى رضا بن عبدالله بن علي رضا المدني

٦٢-الشيخ أبو ذرعبدالعزيز البرعي

٦٣-الشيخ أبي عبدالله المصنعي

٦٤-الشيخ محمدبن علي الصومحي

٦٥-الشيخ أبوعمرصاي بن سالم الحاي

٦٦-الشيخ خالدبن ضحوي الظفيرى

٦٧-الشيخ عبيدبن عبدالله الجابري

٦٨-الشيخ أبي عبدالمعز محمدعلي فركوس

٦٩-الشيخ أحمدبن حجرآل بوطامي

٧٠-الشيخ حمودبن عبدالله بن حمودالتويجري

٧١-الشيخ أبي نصرمحمدبن عبدالله الأيمام

٧٢-الشيخ سعدبن فتحي بن سعيد الزعتري

٧٣-الشيخ هشام بن فهمي بن موسي العارف

٧٤-الشيخ عبدالله بن عبدالعزيز بن العقيل

٧٥-الشيخ. أ.د.ناصربن عبدالكريم العقل

٧٦-الشيخ.أ.د.سعودبن أبراهيم الشريم

٧٧-الشيخ سليمان بن ناصرالعلوان

٧٨-الشيخ أبي عبدالرحمن عبدالحكيم بن محمدبن سعيد البريهى المرشاني

٧٩-الشيخ عبدالرحمن الوكيل

٨٠-الشيخ برهان الدين البقاعي

٨١-الشيخ على بن محمد الزهراني

٨٢-الشيخ محمود لطفي عامر

٨٣-الشيخ يحيى بن على الحجوري

٨٤-الشيخ عبدالمالك بن أحمدرمضاني الجزائري

٨٥-الشيخ أبي بكرعبدالرزاق بن صالح النهمي

٨٦-الشيخ سعدبن عبدالرحمن الحصين

٨٧-الشيخ عبدالله بن عياش الأهدل

٨٩-الشيخ أبوعبدالباري عبدالحميدأحمد العربي الأثري الجزائري

٩٠-الشيخ أبي عبدالأعلى خالدبن محمدبن عثمان المصري

٩١-الشيخ عبدالله بن صالح العبيلان

٩٢-الشيخ عمر المنعم سليم

٩٣-الشيخ عبدالمحسن بن عبدالله زامل

٩٤-الشيخ فيصل بن قزارالجاسم

٩٥-الشيخ احمدبن عطية الوكيل

٩٦-الشيخ عصام بن موسى هادى

٩٧-الشيخ عبدالله محمد الحمادي

٩٨-الشيخ .د.عبدالمعظم البدوي

٩٩-الشيخ أبو إسلام صالح بن طه عبدالوحد

١٠٠-الشيخ عرفان حسونة

١٠١-الشيخ أبي إبراهيم بن سلطان العدناني

١٠٢-الشيخ محمدبن عبدالوهاب البنا

١٠٣-الشيخ حسن عبدالوهاب البنا

١٠٤-الشيخ سليمان بن سمحان

**بابۆموسـولمانان ڕون بێتەوەکەگـەورەزانایان وشـارەزایان لـەکاتی بڵاوبونـەوەی هەرشـتێك کەدژایـەتی بکـات لەگـەڵ دەقـەکانی قورئـان وسوننەت یان یەك نەگرێتەوەلەگەڵ ئەوبنەماگشتی یانەی کەلەقورئان وسـونەتەوە وەرگـیراون ئـەوزانایان فـەتوای حـەرامێتیان بـۆداوە ،جایـەکێك لەوشـتانە بـریتی یەلـەتوتن بەهەمووشـێوەکانییەوە وەچـاندنی،فرۆشـتنی،بازرگـانی پێـوەکردنی داواکـارم لـەخوای پـەروەدگار لەهـەموزانایانمان خـۆش بێـت ولەبەهەشـتی بەریندایێکەوەکۆمان بکاتەوە.**

# بەشی پێنجەم

## وەڵامدانەوەی هەندێك شوبهەسەبارەت بەجگەرەكێشان كەلەهەندێك جگەرەكێش دەبیسترێت

زۆرجارێـك كەسـانێك كـە هەڵەیـەك ئەنجامـدەدەن ئامـادەنین دان بـەو هەڵەیەدابنێن، بۆیە هەوڵ دەدەن بەكۆمـەڵێك شـوبهەی بـەتاڵ بیـسەلمێنن كە كارەكەیان خراپ نییە وچاكە، هەوڵ ئەدەن بەزۆربـەرگی حـەقی بكـەن بەبەردا،بۆیەجگەرەكێشانیش كۆمـەڵێك شـوبهەیان هێناوەوخۆیانیـان پـێ خەڵتاندووە، بەپارمەتی خوای گـەورە لـەم بەشـەدا هەنـدێك لـەو شـوبهانە هەڵدەوەشێنینەوە

**شوبهەی یەكەم:**

بۆچـی جگـەرە كێشان حەرامـە؟ لـە كاتێكدا لەسـەردەمی پێغەمبـەرداﷺ جگەرە نەبووە و لە قورئان و حەدیسدا باسی جگەرە نەكراوە.

**هەڵوەشاندنەوەی شوبهەی یەكەم؟**

ئێمە لە ئیسلامدا یاسای گشتیمان هەیە وەك(هەموو پاكێك حەڵاڵەو هەموو پیـسێك حەرامـە) جـا لـە قورئـان و فـەرمودەدا نـاوی هـەموو پاكـەكان و هەموو پیسـەكان نەهاتووە، بەڵام دەزانین پـاك وپـیس كامەیـە، بۆیـە بـەو یاسایە حـوكمی بەسـەردا دەدرێـت. بـۆ نمونـە خـوای گـەورە لـە قورئانـدا دەفـەرموێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ﴾(تـوخنی مـاڵی هـەتیوان مەكـەون) ، ئەگەر كەسێك بێت و بڵێت من ماڵی هەتیو نـاخۆم بـەڵام دەیـسوتێنم، خـۆ خوای گەورە نەیفەرمووە مەیسوتێنن!!! ئەمە دیـارە تێگەیـشتنێكی زۆر هەڵەیە!!

کەواتە خواردنی شتی زەرەرمەند هەتارۆژی قیامەت حەرامە، ئیتر هەر شتێك بێت، خۆ خوای گەورە لە قورئاندا نەیفەرمووە بیرە، حەشیشە، تریاك حەرامە!!! بەلام مادام زەرەر مەندە دەزانین کە حەرامن با دەقێکی تایبەتیشیان لەسەر نەهاتبێت ئەم دەقە گشتییە دەیان گرێتەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾،واتە: (هەموو شتێکی پیسی لێ حەرام کردوون) جا هەرناوێکی هەبێت!!!

**شوبهەی دووەم:**

کەسانێکی زۆر هەن چەندین ساڵە جگەرەکێشن و هیچ زیانێکیان پێ نەگەیشتووە بەو هۆیەوە!!!

**وەلامی شوبهەی دووەم:**

ئەگەر کێشانی جگەرە زیانی نەگەیاندووە بە لەشی، خۆ زیانی گەیاندووە بە ماڵ وسامانی و ڕەوشتی و دراوسێکانی، وە زیانەکەیشی دەردەکەوێت بەلام وردەوردە، سەیری بکە ئێستا بۆنی دەمی ناخۆشە، ددانەکانی ڕەش بونەتەوە، وە ژینگەشی پیس کردووە، هەرچەندە ئەوانەی کە زیانەکانی جگەرەکێشانیان پێوە دیارنییە زۆرکەمن، بەلام زۆربەیان لێی دیاری داون، وە زۆرینەش حوکمی گشتی هەیە، لەکاتێکدا زانستی پزیشکی زیانەکانی ئاشکراکردووە بۆ هەموو خەڵکی ئیتر هەرکەس بە پێی لەشی خۆی و چۆنێتی و چەندێتی خواردنەکەی کاریگەری لەسەردروست دەبێت.

**شوبهەی سێیەم:**

هەندێك لە جگەرەکێشەکان دەڵێن ناتوانین وازی لێ بهێنین و نەیکێشین!! لەگەڵ خوێنماندا تێکەلاو بووە.

## وەڵامی شوبهەی سێیەم:

بۆچی مرۆڤ دەتوانێت واز لە خواردن و خواردنەوە بهێنێت بۆ چەند ڕۆژێك لە کاتێکدا توشی برسێتی و تونیەتیش دەبێت و دان بەخۆیدا دەگرێت، بەڵام بۆجگەرە ناتوانێت؟ لەکاتێکدا هیچ سودی نییە بۆلەش نەپێی تێردەبێت و نەپێی زیاد دەکات، جاچۆن ڕازی دەبن ببنە بەندەی دوکەڵ و هەواو ئارەزو تامردن.

ئەی بۆچی کاتێك کە عارەق حەرام کرابەتەواوی، ئەو هەموو موسوڵمانە کە چەندین ساڵ وەك ئاو دەیان خواردەوە توانیان دەست بەجێ وازی لێبهێنن؟ ئەوە نیشانەی باوەڕی پتەوە، جا موسوڵمانێك بزانێت خواو پێغەمبەرﷺ شتێکیان پێناخۆشە چۆن وازی لێناهێنێت و دەست بەرداری نابێت لەبەرخواو پێغەمبەرﷺ تا ببێتە خۆشەویستی خوا بەهۆی گوێڕایەڵیەوە بۆی چونکە لەبەر دوکەڵی جگەرە خوا لەخۆی تووڕە دەکات و پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەرﷺ دەکات؟ سبحان الله .

## شوبهەی چوارەم:

ئەگەر جگەرە خراپە ئەی بۆچی فلانە دکتۆر دەیکێشێت؟ یان فلانە مەلاو فلانە مامۆستا دەیکێشن خۆ ئەوان لەشەرع دەزانن؟!

## وەڵامی شوبهەی چوارەم:

جگەرە بەوە حەڵاڵ نابێت کە مەلایەك یان مامۆستایەك بیکێشێت، چونکە ئەوانیش پارێزراو نین لەهەڵە، وە لە هەڵەدا بۆمان نییە چاو لەکەس بکەین، وە مەرجیش نییە کەسێك کەلە شەرعی زانی وەکوخۆی کاری پێبکات.

باشه بۆچی چاو لەیەك مامۆستا بکەین کەجگەرە دەکێشێت بەڵام چاو لەو هەموو مامۆستایانەی تـر نەکـەین کـە جگـەرە ناکێـشن؟ دڵنیـاش بـە ئـەو مامۆسـتایانەی کـە جگـەرە دەکێـشن زۆر کـەمن لـە چـاو ئەوانـەدا کـە نایکێشن! ! !

ئەمە تەنها بیانوگرتنە و هیچی تر چونکە پێغەمبەر ﷺدەفـەرموێت: (کــل بني آدم خطاء وخير الخطائين التوابـــون)(٣٩) واتـە:( هـەموو مرۆڤێـك هەڵـە دەکات، چاکترین هەڵەکارانیش ئەوانەن کە تەوبەدەکـەن و دەگەڕێنـەوە). وە ئێمە وەکو موسوڵمان هـیچ کەسێك نییـە پێشەوامان بێـت لـە هـەموو گوفتارو کردارێکدا تەنها پێغەمبەری خوا نـەبێتﷺ، چـونکە خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ...﴾ (الاحزاب٢١).

**شوبهەی پێنجەم:**

دەڵێن خوای گەورە لەسـەر شـتی وا بـچوك لێپرسـینەوەمان لەگـەڵ ناکـات و سـزامان نادات لەسەری! ؟

**وەڵامی شوبهەی پێنجەم:**

ئەی نازانن خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَـرَهُ * وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ (الزلزلة٧-٨) بەئەندازەی مـسقاڵەزەڕەیەك لێپرسینەوە دەکرێت لەسە چاك وخراپ، ئایا جگەرە لـە مـسقاڵەزەڕەیەك کەمترە وا حیسابی لەسەر نـەبێت؟ ئـەی بـە ئاشـکرا ناکێـشرێت؟ ئـەوەتا پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ﴿کل أمتي معافى إلا المجاهرين﴾ (٤٠) واتـە:

---

[٣٩] أحمد و الترمذي بإسنادٍ حسن.

[٤٠] صحيح جامع الصغير برقم ٦٥٠٤

( هەموو ئوممەتەكەم خواى گەورە لێيان خۆشدەبێت جگە لەو كەسانە نەبێت كە بە ئاشكرا و لەبەر چاوى خەڵكەوە تاوان ئەنجام دەدەن)، لەڕاستیدا جگەرەش بەبەرچاوەوە دەكێشرێت و هاندانە بۆ كەسانى تریش كە بیكێشن، وە ڕێچكە شكاندنە بۆ خەڵك كە تاوان بەئاشكرا ئەنجام بدەن.

چۆن لێپرسینەوەتان لەگەڵ ناكرێت لە كاتێكدا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت : (لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ وَعَنْ عِلْمِهِ مَا فَعَلَ بِهِ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَهُ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَا أَبْلاَهُ )(٤١)

واتە: ( پێى هیچ بەندەیەك ناجوڵێت لە قیامەتدا تاپرسیارى لىٚ نەكرێت تەمەنت لە چیدا بردەسەر؟ وە ئەو زانستەى خوا پێى دابویت چیت پێكرد؟ – ئایا كردەوت پێكرد؟– چۆن ماڵت پەیداكرد وە لە چیدا سەرفت كرد؟ لاشەت لەچیدا كۆتاى هات؟).

باشە جگەرە كێش وەڵامى چى دەبێت بۆ ئەم پرسیارە؟

تەمەنت لە چیدا بەسەربرد؟ لە جگەرە كێشاندا!!!

ئەو زانستەى كە خوا پێى دابویت چیت پێكرد؟ كەدەتزانى جگەرە حەرامەو خراپە بۆ دەتكێشا؟

وە جگەرە فرۆشەكان پرسیاریان لێدەكرێت چۆن ماڵت پەیداكرد؟

دەڵێت جگەرەم دەفرۆشت حەرامم دەرخواردى خەڵك دەدا بۆ ئەوەى پارەم دەست بكەوێت.

---

(٤١) حديث صحيح:رواه الترمذى ٢٤١٧والدارمى فى سننه ١/١٤٤وأبونعيم فى الحلية ١٠/٢٣٢ صحيح الترغيب و الترهيب / برقم ١٢٦

ماڵەکەت لە چیدا سەرف کرد ؟ جگەرە کێش لە جگەرە کێشاندا ! ! !
لاشەت لەچیدا تەواو کرد؟ لاشەم بەهۆی جگەرە کێشانەوە توشی نەخۆشی بوو وەمرد !
جا بزانە چۆن وکێ ئەو پرسیارانەت لێدەکات ؟؟ بشزانە وەلامەکانت چەندە ناشرینە و چۆن ڕوتدێت لەبەردەم بارەگای خوادا ئەم وەلامانە بدەیتەوە ؟؟ جا برای موسوڵمانی جگەرە کێش پێش ئەم خەجالەتیە تەوبە بکەو بگەڕێوە بۆ لای خوا.
**شوبهەی هەشتەم:**
زۆربەیان دەڵێن بۆیە جگەرە دەکێشن بۆ ئەوەی خەفەتمان نەمێنێن ! !
**وەلامی شوبهەی هەشتەم:**
براکەم ئێمە موسوڵمانین دینێکمان هەیە هەموو شتێکی بۆ ڕون کردووینەتەوە بەشێوەیەك شەوی وەك ڕۆژ لێکردووە، وە خەفەتو ناڕەحەتی بە سەر هەمو کەسێکدا دێت بەلام چارەسەرەکەی بە بۆنی ناخۆش و دوکەڵی زەهراوی ناکرێت، ئەوە بۆخۆی دەردەو دەرد زیاد دەکات نەك بە پێچەوانەوە، وە ئێمە پێشەوامان هەیە کە رَسولُ اللّٰهﷺ یە، ئەو هەرکاتێك ناڕەحەت دەکرا لەلایەن بێ باوەڕا نەوە، بەرد باران دەکرا، لەشاری خۆی دەردەکرا، هاوەڵەکانیان دەکوشت، ناوسکی وشتر دەکرا بەسەریدا، بەدرۆیان دەزانی و پێیان دەگوت جادوگەر، یان دەیان گوت جادوت لێکراوە شێت بویت، وە چەندەها ناڕەحەتی تر... بەلام ڕەسول اللّٰهﷺ ، خوم و دایك وباوکم بە فیدای بێت، چی دەکرد؟ ئارامی دەگرت و نوێژی دەکرد، کەواتە بۆ ئێمەش چاو لەو پێشەوایەمان نەکەین ؟ بۆ چاو لەکەسێکی کافرو موشریك و مونافیق و بێ ڕەوشت بکەین؟ !

کاتێك کەتوڕەدەبیت بڵێ: (أَعُوذُ بِاللهِ مِنْ الشَيطانِ الرَّجِمِ) نەك شەیتان فەرماتنت پێبکات و بڵێت جگەرەیەك بکێشە تۆش فەرمان بەرداری بکەیت!!

کاتێك کەسێك خۆشەویستێکی مرد یان ویستی هاوسەرگیری بکات و بە قیسمەتی نەبوو، دەبێت ئارام بگرێت وە باوەڕی هەبێت بەقەزاو قەدەری خوا چونکە مەرج نییە هەرچی ئێمە پێمان خۆشبێت چاکەی تێدا بێت بۆمان، یان هەرشتێکمان پێناخۆش بێت خراپ بێت بۆمان!! لەوانەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ * الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ * أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ﴾( البقرة١٥٦-١٥٧)

وە پاڕانەوەی دڵتەنگی و خەفەت بریتیە لە گوتنی: ( خوایە من بەندەی تۆم کوڕی بەندەتم کوڕی کەنیزەك و کۆیلەتم ناوچاوم بەدەست تۆیە و حوکم و بڕیارت بەسەرمدا ڕابوردووە بڕیاردانت بەسەرمدا دادوەرانەیە داوت لێدەکەم بەهەموو ناوێکت کە هەتە و خۆتت پێناوناوە یان لە کتێبەکەتدا ناردودەتە خوارەوە یان فێری یەکێك لە دروست کراوەکانت کردووە یان لە زانستی نهێنیدا لەلای خۆت هەڵت گرتووە و خۆت دەیزانیت، کە قورئان بکەیتە بەهاری دڵم و نوری سنگم و ڕەوێنەرەوەی دڵتەنگیم و لابەری غەم و خەفەتم) (٤٢)

[٤٢] عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَا أَصَابَ عَبْدًا هَمٌّ وَلَا حُزْنٌ فَقَالَ : اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ ابْنُ عَبْدِكَ ابْنُ أَمَتِكَ نَاصِيَتِي بِيَدِكَ مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ أَوْ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ الْعَظِيمَ رَبِيعَ

**هەرکەسێك توشی ناخۆشی و خەفەتێك ببێت و ئەم دوعایە بخوێنێت ئەوا خوای گەورە غەم و خەفەتەکەی لادەبات و شوێنەکەی پڕدەکاتەوە بەدڵخۆشی، گوترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەری نەکەین؟ فەرموی بەڵێ پێویستە هەرکەسێك دەیبیستێت لەبەری بکات.**

**وە ئەوەش بزانە کە چارەسەر لە شتە حەرامِ کراوەکاندا نییە تا بمانەوێت بەجگەرە کێشان چارەسەری نەخۆشییەکانمان و خەم وخەفەتەکانمان بکەین، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت (من** تداوى بحرام لم يجعل الله له فيه شفاء)(٤٣) **واتە: ( هەرکەس بە شتی حەرام کراو تەداوی بکات ئەوا خوای گەورە شیفای نادات" واتا شتی حەرامکراو شیفای تێدا نییە").وقال ﷺ**{إن الله تعالى خلق الداء والدواء فتداووا،ولاتتداووابحرام} صحيح الجامع ج١ص٢٦٢رقم١٧٦٢الصحيحة١٦٣٣ ،وقال ﷺ﴿من تداوى بحرام لم يجعل الله له فيه شفاء﴾الصحيحة٢٨٨١/ **ئەم فەرمودانەو چەندین فەرمودەی تر بەڵگەن لەسە ئەوەی کەچارەسەرنییە لەوشتانەدا کەخواحەرامی کردووە،جاباهیچ موسڵمانێك هەڵ نەخەڵەتێت بەوەی کە پێی بگوترێت جگەرە بکێشە بۆنەخۆشی شەکرە باشە یان بۆلاواز﴿زەعیف﴾بوون باشە یان بۆدان ئێشە یان گوێئێشە ......باشە ئەمانە هیچی نابنە بەڵگە وئەوحەرامەی پێ حەلالْ نابێت .**

---

قَلْبِي وَنُورَ صَدْرِي وَجَلاءَ حُزْنِي وَذَهَابَ هَمِّي إِلَّا أَذْهَبَ اللَّهُ حُزْنَهُ وَهَمَّهُ وَأَبْدَلَهُ مَكَانَهُ فَرَحًا. رواه أحمد، وفي سلسلة صحيحة رقم ١٩٩، و صحيح الكلم الطيب ص٧٤

[٤٣] السراج المنير برقم/ ٦٣٧٦، سلسلة الصحيحة ٢٨٨١

## شوبهەی حەوتەم:

هەندێك لەوانەی كە جگەرە دەفرۆشن دەڵێن: تازە ئێمە فێر ی ئەم كارە بوین و ژیانمانی لەسەرە كەواتە جگەرە فرۆشتن بۆ ئێمە حەڵاڵە چونكە ئیشی ترمان نییە، یان كەسێك دەڵێت گەنجینە (مەخزەن)ێكم هەیەو داومە بەكرێ بەیەكێك ئەویش جگەرەی تیادادەنێن، وە من پێویسم بەو پارەیە زۆرەو بژێوی ترم نییە ئیتر ئەو كرێیە بۆ حەرامە ؟؟؟

## وەڵامی شوبهەی حەوتەم:

بۆ وەڵامی ئەو كەسانە شێخ ابن باز فەرمویەتی: ( جگەرە كێشان حەرامە وە كڕین و فرۆشتنیشی حەرامە وەهەروەها دوكان بەكرێدان بۆ جگەرە فرۆشتن حەرامە تەنانەت هاوڕێیەتی كەسی جگەرە كێش لە كاتی كێشانیدا دروست نییە)(٤٤)

كەواتە برای بەڕێزم خۆت لە هاوڕێیەتی جگەرە كێش بپارێزە یا فێر نەبیت لێوەی. واجبە لەسەر ئەو موسوڵمانەی كە بۆی دەركەوت كارەكەی حەرامە وازیلێبهێنێت لەبەرخوا، وە خوای گەورەش حەقی بۆدەكاتەوە: (وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا * وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ) موسوڵمان دەبێت لەخوا بترسێت و تیكەی حەڵاڵ بدات بە منداڵەكانی و لە حەرام بیان پارێزێت.

---

[٤٤] قال في اللجنة الدائمة: ( لاتجوز زراعة الدخان ولا بيعه ولا إستعماله لانه حرام من عدة الوجوه لإضراره الصحية العضيمة ولخبثه وعدم فائدته) رقم الفتوى ٥٩٤٨

ئەو کەسانەش کە دوکان و گەنجینەیان داوە بە کرێ بە جگەرە فرۆش، ئەوا دەتوانێت بیدات بە کەسێکی تر بۆ کارێکی حەڵاڵ قەیدی چیە ئەگەر کرێی کەمتریش وەربگرێت، چونکە موسوڵمان بیروباوەڕی وایە کە خوێ و ماڵ وسامان و هەموو شتێکی بەخشینی خوایە پێی ئیتر بۆچی لەڕەزامەندی ئەودا بەکاری نەهێنێت؟!

**شوبهەی هەشتەم:**

خۆ جگەرەکێشان تاوانێکی هێندە گەورە نییە ئیتر بۆ ئەوەندە بەگەورە گرتوتانەو دەڵێن حەرامەو مەچن بەلایدا؟

**وەڵامی شوبهەی هەشتەم:**

هەندێك لە زانایان فەرمویانە هەموو تاوانێکی بچوك ئەگەر پێنج مەرجی تێدا هاتەدی ئەوا دەچێتە ڕیزی تاوانە گەورە کانەوە (الکبائر).

١- سور بون لەسەر ئەو تاوانە بچوکە، واتا بزانێت حەرامەو هەر بەردەوام بێت لەسەری.

٢- تەمبەڵی کردن لە وازلێهێنانیدا، واتا سستی بنوێنێت لە دەست لێهەڵگرتنی داو بڵێت دوایی تەرکی دەکەم و بەردوام درەنگی بخات.

٣- دڵخۆشبوون پێی، واتا کاتێك جگەرەکە دەکێشێت پێی ئاسودە ببێت.

٤-شانازی پێوەکردنی لەناو خەڵکیدا، واتا بەفیزەوە بیخوات و لوت بەرزی پێوە بکات.

٥- دڵخۆش بێت بەوەی کە کەسانی تریش شوێنی بکەون، یان جگەرە بۆ خەڵکی دابگرسێنێت و پێی خۆش بێت./ئەم سیفەتانە لەجگەرەکێشەکاندا بەئاشکرا دیارە ازانای بەناوبانگی مەزهەبی شافعی ناسراوبەنجم الغزی فەرموویەتی: (وليس من الكبائر تناوله المرة أو المرتين ، أي بل الإصرار عليه يكون كبيرة كسائر الصغائر) (٤٥)

واتە: کە بەردەوام بوو لەسەری حوکمی تاوانە گەورەکانی هەیە، هەرچەندە بەداخەوە جگەرە کێشی وامەیە کە زۆر بەجدی جگەرە دەکێشێت، دکتۆریك باسی کرد کە لە هاوینی ساڵی(٢٠٠٩) خۆڵ بارینێکی زۆر بوو بۆیە دەمامکە پەڕۆینەکانیان دابەش کردبوو بەسەر خزمەت گوزارەکانی یەکێك لە نەخۆشخانەکاندا تا بیکەنە دەم ولوتیان و خۆڵبارینەکە زیانیان لێنەدات، ئەو دکتۆرە گوتی چومە یەکێك لە نەخۆشخانەکان بینیم یەکێك لە کارگوزارەکان لە حەوشەی نەخۆشخانەکادابوو پاکی دەکردەوە وە یەکێك لەو دەمامکانەی لە دەم ولوتدابوو بەڵام لەئاستی دەمیدا کونێکی کردۆتە دەمامکەکەو جگەرەیەکی بەدەمەوەیە دەیکێشێت !!! وای زانیوە خۆڵەکە زیانی زیاترە بەڵام بە پێچەوانەوە جگەرەکە زۆر زەرەر مەند ترە.

**<u>شوبهەی نۆیەم :</u>**

جگەرە کێشی وامەیە دەڵێت من چەند جارێك تەوبەم کردووە کە جگەرە تەرك بکەم، تەنها بۆ ماوەیەك وازم لێهێناوەو بەڵام دوایی

---

[٤٥] فتاوى في حكم شرب الدخان ص١٢-١٣

دەستم پێکردۆتەوە بۆیە دەڵێن تازە تەوبەت لێوەر ناگیرێت چونکە تەوبەت شکاندووە!!(٤٦)

**وەڵامی شوبهەی نۆیەم:**

جگەرە کێشان حەرامە وەك لە ڕابوردودا دەرکەوت، بەڵام ئێستەش بۆت هەیە تەوبەبکەیت و پەشیمانی تازە بکەیتەوەو وازی لێبێنیت بەتەواوەتی و نەگەڕێیتەوەسەری، وە ئەوەش ڕاست نییە کەبگووترێت تەوبەت لێوەرناگیرێت چونکە ڕاست وایە دەرگای تەوبە داناخرێت تەنها لەدوو کاتدا نەبێت:

١- کاتی گیان کێشان کە خەریکە ڕۆح دێتەدەرەوە لەلاشە.

٢- کاتێك خۆر لە خۆر ئاواوە هەڵدێت و ئیتر کۆتایی بەوەرگیرانی تەوبەدێت. ئەی موسوڵمانی جگەرە کێش تاکو ئەو دوو کاتەت بەسەردا نەهاتووەو تەوبە بکە لە سەرجەم تاوانەکانت بەتایبەتی لە جگەرە کێشان، داواکارم خوای گەورە تەوبە لە ئێمەو لە تۆش وەربگرێت، ئامین.

[٤٦] هەندێك لەبەتەمەنەکان کە چەندین ساڵە جگەرە دەکێشن لێان بیستراوە دەڵێن ئەسحابەکانیش جگەرەیان کێشاوە!!! ﴿سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ﴾ ئەوە بوهتانێکی گەورەیە ناتوانرێت بەبەڵگە بسەلمێنرێت، ئەسحابەکان (رضي الله عنهم) کەسانێك بوون خوای گەورە لێیان خۆش بووە ﴿رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ حاشا ئەسحابە وانەبوون!!!

**شوبهەی دەیەم:** کەسێك خۆی جگەرەکێش نییە، بەڵام کاتێك باوکی یان برایەکی داوای لێدەکەن بچێت بۆیان بکڕێت ئەو گوێڕایەڵیان دەکات و دەڵێ گوێڕایەڵی باوك پێویستە!!

**وەڵامی شوبهەی دەیەم:**

دروست نییە بە هیچ شێوەیەك جگەرە بکڕیت بۆ باوك یان بۆ برات، لەبەر ئەوەی یارمەتی دانە لەکاری حەرامدا، نابێت نەجگەرە نە مەشروب نە تریاکی بۆ بکڕت...

بەڵکو واجبەلەسەرت بە جوانی ئامۆژگاریان بکەیت و تێیانبگەیەنیت وەئەگەر تەرکیشیان نەکرد ئەوەندەیان تێبگەیەنە کە دروست نییە تۆ بچیت بۆیان بکڕیت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلا تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾(المائدة٢) واتە: (یارمەتی یەکتر مەدەن لە خراپەو دوژمنکاریدا )، بێگومان گوێڕایەڵی دایك وباوك واجبەلەسەرمان بەڵام لەکاری چاکدا نەك لە خراپەدا، لەکاری ناشەرعیدا دروست نییە گوێڕایەڵیان بین چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (لا طاعة لمخلوق في معصية الله، أو في معصية الخالق) وەدەفەرموێت: ( إنما الطاعة في المعروف) واتە: (گوێڕایەڵی هیچ بەندەیەك ناکرێت لە بێ فەرمانی خوادا)، بەڵکو ( گوێڕایەڵی تەنها لە چاکەدایە)، وە ئەگەر فەرمانمان پێبکەن بە جگەرە کڕین یان فرۆشتن ئەوە دروست نییە گوێڕایەڵیان بین.

**شوبهەی یانزەیەم:**

جگەرەتان ئەوەندە حەرام کردووە تەنانەت هەندێك لە مامۆستایان دەڵێن ئەگەر کەسێك لەپارەی جگەرە فرۆشتن خێربکات خوای گەورە لێی وەرناگریت، خێر هەرخێرە ئیتر بۆچی وەر گیراو نییە؟!.

**وەلامی شوبهەی یانزەیەم:**

بەڵی ئەو مامۆستا بەڕێزانە ڕاسیان فەرمووە گەر زانیبێتت کێشانی جگەرەو فرۆشتنی حەرامەو هەر کردبێتت ئەوا خۆت زانیوتە کە ماڵ و سامانەکەت حەرامە وە خێرو صەدەقەش لە ماڵی پاك دەکرێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ﴾(البقرة٢٦٧) وە پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ لاَ يَقْبَلُ إِلاَّ طَيِّباً) ( خوا پاکەو پاکیش نەبێت وەریناگرێت)(رواه مسلم) بەڵام کەسێك نەیزانیبێت کە کڕین وفرۆشتن بە جگەرەوە حەرامە یان گومانی هەبوبێت کە ئایا حەرامە یان حەڵاڵە، إنشاء الله تاوانبار نابێت و خێرو خێراتەکەیشی بە ئیزنی خوا شوێنی خۆی گرتووە، بەمەرجێك کە بیستی جگەرە حەرامە تەوبەبکات و نەگەڕێتەوە سەری.

**شوبهەی دوانزەیەم:**

هەندێك لەو جگەرە کێشانەی کە هێشتا گەنجن دەڵێن: من ئێستا جگەرە دەکێشم بەڵام پەیمانم دەوە کە هاوسەرگریم کرد وازی لێدەهێنم!

**هەڵوەشاندنەوەی ئەم شوبهەیە:**

سەیرە کە ئەمە گوتەی موسوڵمانێکی ژیری تێگەیشتوبێت!! چونکە وەك لە پێشدا باسکرا جگەرەکێشان حەرامە، ئیتر کەزانرا حەرامە پێویستە

بەپەلە وازی لێبهێنرێت چونکە کێ دەزانێت کە فریای تەوبە دەکەوێت یان مردن پەخەت پێدەگرێت؟ لەدوای مردنیش خەجاڵەتی دەکێشێت.

ئەی ئەگەر ئەو ژنەی بۆ نەبوو ئایا هەر بەردەوام دەبێت لەسەر جگەرەکێشان؟ ئایا وانازانن ئەمە مەرج دانانبێت لەسە خوای گەورە بەوەی ئەگەر خوا ئەوکارەم بۆ ئاسانبکات منیش لە بەرامبەر ئەوەدا واز لە حەرام دەهێنم! ئەو مەرج دانانە کارێکی حەرامەو تەنها خۆ خەڵەتاندنەو هیچ سودیی پێناگەیەنێت! چونکە تاجگەرەیەك زیاتر بکێشێت تاوانێك زیاتری لەسەر دەنوسرێت.

**شوبهەی سیانزەیەم:**

هەندێك دەڵێن جگەرە نە حەلاڵەو نەحەرامە، بەڵكو لەوشتانەن کە گومانیان تێدایە – مَشْتَبِهات – ئیتر بۆچی بگوترێت حەرامە؟!

**وەڵامی شوبهەی سیانزەیەم:**

لەبەڵگەکانی ڕابوردودا سەلمێنرا کە جگەرە لە حەرامەکانە، بەڵام لەسەر قسەی خۆیان دەڵێین باشە لە گومان لێکراوەکانە﴿من باب التنازُل﴾، ئەی باشە بە گوێرەی فەرمایشتی پێغەمبەرﷺ گومان لێکراوەکانیش بەرەو حەرامان دابەن؟ وە دورکەوتنەوەلێیان واجب نییە؟ پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: (إِنَّ الْحَلاَلَ بَيِّنٌ وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ وَبَيْنَهُمَا مُشْتَبِهَاتٌ لاَ يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ) واتە: (بەڕاستی شتە حەلاڵەکان دیارو ئاشکران، وە حەرامەکانیش دیارو ئاشکران، لە نێوان حەرام وحەلاڵدا کۆمەڵە شتێك هەن کە _ مُشْتَبِهَات_)ن کە نادیارن واتا نەبە ئاشکرا حەلاڵن وەنە

بەئاشکرا حەرامن، زۆرینەی خەڵکیش نایانزانن، جا هەر کەسێك خۆی بپارێزێت لێیان ئەوە پارێزگاری کردووە لە ئاینی خۆی ولەوەش کەخەڵك بەخراپەناوی ئەبەن وغەیبەتی ئەکەن هەر کەسێکیش کەوتە ئەو شتانەوە کە شوبهەیان لەسەر ئەوە دەکەوێتە حەرامەوە...).

لەم فەرمودەیەدا دیارە کە دەفەرموێت (هەر کەسێکیش کەوتە ئەو شتانەوە کە شوبهەیان لەسەر ئەوە دەکەوێتە حەرامەوە) ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر حەرام کردنی جگەرە، ئەگەر بەبەڵگەشی نازانن ، ئەوە دەڵێین بێگومان جگەرە حەرامە چونکە دەقی ئاشکرامان لەسەر باسکردکە دەیسەلمێنێت جگەرەکێشان حەرامە.

شوبهەی چواردەهەم:

هەندێك دەڵێن ئێمە جگەرە دەکێشین بەڵام -فلتەر- بەکاردەهێنین کەژەهرەکەی دەگێڕێتەوەدەی مادام زیان بەلاشە نەگەیەنێ حەرام نیە؟!!!!!

وەڵامی شوبهەی چواردەهەم:

لەپێشداباسمان کردکەزانستی پزیشکی ئەوەی سەلمان دوە کەهەر بەو شێوەیش زیان لەلاشە دەدات،گەروایشی دابنێین کەزیانی نیە بۆلاشە!!!

هەرحەرامە چونکە ئەگەر تۆ فیلتەر بەکاربێنیت خۆ ئەو کەسانەی کەلەدەوروبەری تۆن ناتوانن هیچ بەکاربهێنن وتوشی زیان وزەرەردەبن،ئەمەلەلایەك وەلە هەمان کاتداسەروەت وسامانێکی زۆری خۆت بەفیرۆتەدەیت ودیسان لەم لایەشەوەهەرتوشی حەرام بویت وەك لەپێشەوەڕونمان کردەوە!!!!!

## شوبهەی پانزەهەم:

زۆر جار دەبینین کەسێك کارێکی خراپ دەکات کەلەوکارەئاگاداری دەکەیت دەڵێ:گرنگ دڵەدڵم پاکەجگەرەکێشیش وادەڵێت دەڵێت گرنگ دڵە!!!

## وەلامی شوبهەی پازدەهەم:

١-گەربەڕاستی لەدڵدامل کەچی تەواوی بۆخواهەبوایەئەوابەکردارپێچەوانەی فەرمانەکانی پەروەردگاری نەدەکردوترسی خواوای لێدەکردکەلەخراپەدورکەویتەوە چونکە فەرمان لەدڵەوەدەردەچێت کەواتەلەڕاستیدا دڵی پیسە!!!

پێغەمبەرﷺفەرمووی ﴿پارچەیەك گۆشت لەجەستەی مرۆڤدایەگەرصالح بێت لاشەهەمووی صالح دەبێت گەرفاسد بێت لاشەهەموی فاسد دەبێت ئەویش دڵە﴾

٢-پێغەمبەرﷺفەرموی﴿خوای گەورە سەیری شێوەتان ناکات وسەیری ماڵ وسامانتان ناکات بەڵکوسەیری دڵتان وکردارەکانتان دەکات﴾(اخرجەمسلم وابن ماجەعن أبي هريرە،غايةالمرام/ج١ص٢٨٠/رقم١٨٦٢).

جگەرەکێشانیش فەرمانی خراپی دڵە!بەکرداریش ئەنجامی دەدەیت ئەوەدەردەکەوێت کەدڵت پاك نییەو کردارەکەیشت خراپە!لەوەسەیرترئەوەیەکەسی وامەیەنوێژناکات ڕۆژووناگرێت،لەگەڵ ئ[illegible] فرە[illegible] [illegible]مەحرەم دێت ودەچێت ئنجادەڵێ:دڵ مەرجەدڵم پاکە-ئ[illegible]وەشەیتان‌کرداری خراپ جوان دەکات لایان ودوای دەیخاتە دڵیان کەئەم شوبهەیەبهێننەوە،کەلەماڵی جاڵجاڵۆکە لاوازترەشەیتان کەی وویستی ،شوبهە فڕێ دەداتەبەردەمی لاوازونەزانەکان وسەرئەنجام لەخشتەیان دەبات ،بەیان خاتەژێرپێ ﴿يحسبون أنهم يحسنون صنع﴾(وەئەوانیش وادەزانن کەکارێکی زۆرباش ئەنجام دەدەن)...

شوبهەی شازدەهەم:

هەندێك بگرە زۆربەیان لەجگەرەكێشەكان دەڵێن :كەئێمە جگەرەدەكێشین لەدوای جگەرەكێشانەكەئیسراحەت دە ەین ومێشكمان پێی ساف دەبێت وخەفەتمان لەبیردەباتەوە!!!!

وەلأمی ئەم شوبهەیە:

ئەم ووتەیەوتەی ئەوانەیشەكەعارەق دەخۆنەوە!!!

موسوڵمانی بەرێزوخۆشەویست بزانە كەخوای گەورە توانای داوەبەجنۆكەوشەیتانەكان بەئیزنی خواخەڵكی نارەحەت دەكەن تاماوەیەك تاپەنای پێببەنەكاری حەرام و نادروست !!كەپەنای بردەبەركاری نادروست وحەرامی ئەنجام دا ئەوكاتەئەو شەیتانەلێی دوردەكەوێتەوەولەنارەحەتییەكەی چاك دەبێتەوە!!چونكەشەیتان تائەوەندەكاری پێی بووتا گوناهەكەی پێ ئەنجام دا،وەك چۆن جنۆكەیەك ئازاری كەسێك دەدات ودەچێتەلەشیەوەو دوای دەیخاتەدڵی كەس وكارییەوە كەببیەنە سەر فلأنەقەبرتاشیفای بدات كەبردیان ئەو كاتەبەفەرمانی خواچاك دەبێتەوەئەوكاتە ئەوان دەڵێن فلأن قەبرو پیاوچاك شیفای دا،واتەدڵ دەبەستن بەغەیری خواوە،شەیتانیش ئەوەی دەوێت ئەوەتاقی كردنەوەی خوایە بۆبەندەكانی تادەربكەوێت كێ لەسنوری خوادەوەستێت وشوێن حەرامەكان ناكەوێت وكێش سنور بەزێن وخراپەكارە !!!

جاناگاداربەشەیتان فێڵت لێ نەكات گەر توشی نارەحەتی بویت پەنابۆخوابەرەو داوالەوبكەو قورئان بخوێنە یان گوێی لێبگرە ،دەست نوێژ بگرەونوێژبكەئەوەكاری كەسی موسوڵمانەنەك پەنا بۆحەرام وناشەرعییەكان ببەیت وخۆت خەسارەت مەندو خەجاڵەتی رۆژی دوای بكەیت ...

# بەشی شەشەم

## چۆن خۆت ڕزگار دەکەیت لە جگەرەکێشان؟

دوای ئەوەی کە بۆت ڕون بویەوە ئەی برای خوێنەر کە جگەرەکێشان حەرامە، لەبەر ئەوەی زیان بەخشە بەلاشەو ماڵسەرف کردنە لە شتی بێسوود دا، وە نارەحەتیە بۆ دەوروبەرەکەت، وە دەشزانیت کە لە ئەدەبو ورێز نییە خەڵکی بە دوکەڵ و بۆنی ناخۆش بێزار بکەیت، دەی کە ئەمەت زانی وەك شێخ جەمیل زینۆ دەفەرموێت: (فَاترك التدخين ولا تكن من المجادلين) واتە: (واز لە جگەرە بهێنەو لە موناقەشە کاران مەبە)، وە هەموو کەسێکی ژیر دەزانێت ئەگەر یەکێك ڕۆژانە چەند دینارێك بسوتێنێت پێی دەگوترێت شێت!!!

ئایا دەبێت بەجگەرە کێش بگوترێت چی؟!! کە ڕۆژانە پارە دەسوتێنێت؟ مرۆڤ گوڕانی بەسەردادێت و دەتوانێت خۆی بگۆڕێت لەهەر شتێك کەبەخراپی دەزانێت بۆ شتی چاك، بۆیە لێرەدا چەند خاڵێك باس دەکەین کە هۆکارن بۆ وازهێنان لە جگەرەکێشان.

بەشتیوانی خوا هەرکەسێك ڕەچاویان بکات خوای گەورەش یارمەتیان دەدات بۆ تەرك کردنی إن شاالله بانگەوازکاران هەستن بەواجبی سەر شانیان وئاگاداری خەڵکی بکەن لەو دەردەو حوکمی شەرعی ڕوونبکەنەوە لەوبارەیەوە.

١- لەلای هەوڕێکانت پەیمان بدە بە خوا کە ئیتر تەوبە بکەیت و جگەرە نەکێشیت، ﴿يَا لَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ الْقَرِينُ﴾(الزخرف٣٨)وەهاوڕێیەتی جگەرەکێشە کان تەرك بکە.

٢- كاتێك حەزت لە جگەرەكرد دڵ نەوایی خۆت بكە بە خواردنی میوەبەسودەكان وەك پرتەقاڵ، سێو، جۆرەكانی تری میوە.

٣- كەم خواردنەوەی چا و قاوە، وەزۆر خواردنەوەی شەربەتی میوە بەهەمو جۆرەكانیەوە، وە خواردنەوەی ماستاو كە یارمەتی دەرێكی باش دەبێت إنشاء الله.

٤-دان بەخۆدا گرتن و نەگەڕانەوەسەر كێشانی بەتایبەتی لەڕۆژەكانی سەرەتای وازلێهێنانی، ئەوەش بزانە كە ئارامگرتن پاداشتی خوایی لەسەرەو هۆكارێكە بۆئەوەی خوای گەورە خۆشیبوێت، ﴿وَاللَّـهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ﴾.

٥-دوربكەوەرەوە لەوانەی كە جگەرە كێشن و هەوڵبدە تەنانەت بۆنیشی نەیەت بەسەرتدا، وە ڕێگەمەدە لەماڵەكەتدا هیچ كەسێك جگەرە بكێشێت، تەپڵەكی جگەرەش لەناوبەرە با لەماڵتا نەمێنێت.

٦-دروست نییە بۆ موسوڵمان كەلە جەژن و بۆنە كاندا جگەرە بگێڕێت بۆ میوان، چونكە سەرپێچی خوای گەورەیەو شەرعی خوا پێی ڕازی نییە و خەڵكیش ناڕەحەت دەكات.

٧- چونە لای دكتۆری شارەزا لەو بوارەدا تائامۆژگاریت بكات و گوێڕایەڵیشی بكە_لەچاكەدا_

٨- كاتی توڕەبون بڵێ (أَعُوذُ بِاللهِ مِنْ الشَيطانِ الرَّجِمِ) وە دەستنوێژ بگرێت تا ئاگری توڕەبونەكەی بكوژێتەوە نەك بە دوكەڵ وئاگر بیەوێت بیكوژێنێتەوە، چونكە جگەرە نەك نایكوژێنێتەوە بەڵكو هاندەرێكی باشە بۆ توڕەبون.

٩–بەڕۆژو بونی ڕەمەزان یارمەتی دەرێکی باشە بۆ تەرك كردنی جگەرە، چونكە (٣٠)ڕۆژ نایكێشێت، ئەگەر هەوڵ بدات شەوەكانیشی نەیكێشێت ڕاهێنانێكی باشە بۆ تەرك كردنی.

١٠– بەبەردەوامی داواكردن لەخوای گەورە كەیارمەتیت بدات لەسەر نەچونەوە سەر جگەرەكێشان، وە بڵێت: خوایە جگەرەم لەبەرچاو قێزەون بكە، وە وزانراویشە هەركەسێك لەبەر خوا واز لە كارێك بهێنێت ئەوە خوای گەورە لەوە چاكتری پێ دەبەخشێت.

١١–زۆر بەكار هێنانی سیواك یارمەتی دەرێكی باشە، وە هاوڕێیەتی كردنی كەسانێك كە جگەرەكێشنین.

١٢– لەدوای ڕۆژو شكاندن پەرداخێك شەربەتی مێوژ یان پرتەقاڵ یان لیمۆ بخورێتەوە.

١٣–جگەرەكێشان خووە، وە هەموو خوویەكیش دەتوانرێت وازی لێبهێنرێت، باچەند ساڵێكیش بێت بەردەوام بێت لەسەری، چونكە كەسی وا هەیە لە تەمەنی (٦٠–٧٠)ساڵیدا جگەرەی تەرك كردووە ئیتر بۆچی گەنجێك وازی پێ لێناهێنرێت؟

چەندین گاوورو جولوكە جگەرە تەرك دەكەن لەبەر ئەوەی زیانی بۆ لاشەیان هەیە، بەڵام موسوڵمانی واهەیە لەگەڵ ئەوەی كە دەزانێت زیانی بۆ دینەكەی هەیە كەچی وازی لێناهێنێت، ئایا ئەگەر موسوڵمانێك كۆششی لەگەڵ نەفسی خویدا بۆ نەكرێت، ئیتر چۆن كۆششی كافرو بێ باوەڕانی پێ دەكرێت؟؟(٤٧).

[٤٧] تحقيق البرهان في شأن الدخان الذي يشربه الناس الآن/ ص١٦٣، حكم الدخان والتدخين على ضوء الطب والدين/ ص١٨–١٩.وأخطار التدخين والمخدرات أدلة التحريم وطرق العلاج_جمع وترتيب الشيخ وجيه حبشي رمضان/ص_٤٤_٤٦.

١٤-پێویستەلەسەر دەوڵەت و حکومەت ولایەنی پەیوەندی دار، کە کێشانی جگەرە قەدەغەبکەن،بەتایبەتی لە شوێنە گشتییە کاندا وەك: فرۆکەخانەو ناو پاص و شەمەندەفەرو، نەخۆشخانەو چێشت خانەو قوتابخانەو سەرجەم دام ودەزگا دەوڵەتیەکاندا، وە هەرکەسێك سەرپێچی کرد غەرامە بکرێت .

١٥-لەپێشدا دکتۆرەکان_لەموسوڵمانان و_مامۆستایان بەگشتی ومامۆستایانی ئاینی بەتایبەتی لەخوابترسن و واز بهێنن لەجگەرەکێشان تانەبنە پێشەوای خەڵکی لەخراپەوتاواندا،وەئەگەرنا هەرکەس چاولەئێوە بکات وبەردەوام بێت ئێوەش تاوان بارن.

١٦-پێویستە لەسەردەوڵەت کرین وفرۆشتن بەتوتن وجگەرەوە قەدەغە بکات.

١٧-قەدەغەکردنی ریکلام بۆجگەرەلەهەموو راگەیاندنەکانی وەك:بینراو،بیستراو،نوسراو،بەتایبەتی لەوولاتانی ئیسلامیدا.

١٨-لەراگەیاندنەکانەوەبەرنامەی چاك وئامۆژگاری خێریلاو بکرێتەوەوزیانەکانی جگەرەبخرێتەروو بەهیوای ئەوەی کەسودی ببێت،وەتایبەت کردنی رۆژێك لەساڵدا بۆبەگژداچونەوەی جگەرە(وەك ئەوەی هەموساڵێك ٣١-٥بەرۆژی بەگژداچونەوەی جگەرە ناو دەبرێت ئەمەچارەسەرنییە لەراستی) دا..

## بۆچی وازت له جگەره کێشان هێناوه؟(٤٨)

ئەم پرسیاره ئاراستەی چەند جگەره کێشێك کرا ئەوانیش له وەڵامدا گوتیان:

- ئەوەی که پاڵنەرو هاندەرم بوو بۆ وازهێنان له جگەره ئەوەبو بیرم کردەوه من لەسەرەتای خواردن وخواردنەوەی هەموو شتێك دەڵێم (بسم الله) کەچی بۆ جگەره وام نەدەگوت( خۆزگە هەموو جگەره کێشێك ئاوا بیری بکردایەتەوه).

- ئەوەی که پاڵنەرو هاندەری من بوو بۆ وازهێنان لەجگەره بیرم کردەوه که جگەره شتێکی زۆر بێنرخ و بێکەڵکه چونکه من پاشماوەکەی دەخەمە ژێر پێڵاوەکانم وبیپڕێز وبێ نرخ مامەڵەی لەگەڵدا دەکەم!!(خۆزگە هەموو جگەره کێشێك پەندی وەربگرتایه). ﴿ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾.

ئەگەر جگەره له پاکەکانه بۆچی لەناو مزگەوت یان له مەجلیسی پیاو چاکاندا ناکێشرێت، بەڵام زۆر له گەنجان له گەرماوو سەرئاوەکاندا دەیکێشن تاکو کەس پێیان نەزانێت!!!

[٤٨] گۆڤاری ڕێگای ڕاست ژماره ٨ ساڵی ١٤٢٧ك لاپەره ١٥٢.

## ئەبێ چیتر ناوت نەهێنم(٤٩)

ئەبی چیترناوت نەهێنم!

پێشتر هەموو کاتێك حەزم لە بۆن کردنت بوو، هەردەم لە دڵەوە تۆم بە نزیکی خۆم دەزانی، تۆم کردبوو بە دۆستێکی دانەبڕاوی پەنجەکانم، شەوو ڕۆژو زستان و هاوین دۆستی تۆبووم، هەرچەندە خراپەو زیانەکانی تۆیان بۆ باس دەکردم باوەڕم نەدەکرد، ئەموت هەڵبەستراوە، واتە تۆم لەهەموو دۆستێك بەدڵسۆزتر دەزانی، زۆر شێتانە تۆم خۆش دەویست ، وام ئەزانی بەدابڕانم لەتۆ توشی ناخۆشی و نائومێدی دەبم، هەردەم شانازیم پێوەئەکرد ئەتۆم بەیەکێك لە هۆکارەکانی پیاوەتی و کەسایەتی ئاست بەرز دەزانی، بەڵام ئێستا لەیەکتری دورین.

لەدۆستایەتیت ڕزگارم بوو، ئاخر تۆ دۆستەکانت دەسوتێنیت، بۆ یەکەم جار هاوڕێیەکی دڵسۆز تۆی بەمن ناساند من وام ئەزانی کە هاوڕێیەکی ژیرو دڵسۆزم هەیە، ئاخ لەوڵاتی من دا نەزان چەند زۆرە! هەرگیز ئەو ڕۆژەم لە بیر ناچێت کە پێویستم بە کتێبێك بوو بەڵام پارەکەیم لە تۆدا خەرج کردبوو نەمکڕی و لەبەربێ پارەیی نەمتوانی بچم بۆ ئینتەرنێت بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر بابەتەکەم کۆبکەمەوە، بۆ یە لەو وانەیەدا دەرنەچووم، ئەو هاوڕێیەش کەتۆی پێناساندم

---

[٤٩] گۆڤاری سۆز ژمارە ١ ساڵی ٢٠٠٩ ز لاپەڕە ٥٢ ( نوسەری ئەم بابەتە مەڤان سامی زوارەی "سکاڵای جگەرەکێشێك لەدەست جگەرە کێشان".

هەفتەی ڕابوردو بە شێرپەنجەی سیەکانی کۆچی دوایی کرد. ئەبێ تائێستا جەرگی چەند دایکت سوتاندبێت(٥٠) مالّی چەند کەست وێران کردبێ و نانی چەند کەست بڕیبێ؟! وام دەزانی لەزانکۆدا بە هاوڕێیەتی تۆ سەرنجی کچەکان ڕادەکێشم(٥١)

بەلاّم ئەوڕۆژە کچێکی هاوڕێم گوتی کە بۆنی تۆ هەمویانی هەراسانکردووە، نایانەوێت ئیتر قسەم لەگەڵبکەن لەبەر بۆنی دەمم، هەنوکە لەڕوم نایەت پێبکەنم چونکە ددانەکانم وەك ددانی ئاژەڵی گیاخۆر زەرد هەڵگەڕاون ماوە ماوەش ژان دەکەن، کۆخەیەکیشم توش بووە شەوانە ناهێڵێ بخەوم، هەردەم خۆمم خەڵەتاندووە کە ئەم وت ئەی بۆچی سیروانی هاوڕێم لەمن زیاتر دەکێشێ و هیچ کێشەیەکی نییە، مەگەر کەس لەدەردی کەس ئاگادار نییە.

لەسەرەتادا هاوڕێیەتی تۆم لە خێزانەکەم دەشاردەوە، دوایش چەندە هەوڵیان دا سودی نەبوو، بەیانیان لەبری هەناسەیەك لەهەوای سازگاردا دوکەڵم هەڵدەمژی، ئای چ گەمژەییەکە؟! لەپێمدا برینێك هەبوو هەر چاك نەدەبویەوە، دکتۆر پێیگوتم دەبێ واز لەتۆ بێنم،

[٥٠] بەدلخەوە زۆرێك لەگەنجان کە جگەرە دەکێشن دایك وباوك و برای چەندە ئامۆژگاری دەکەن گوێیان بۆناگرێت و وازی لێ ناهێنێت، دایك وباوکیش خەمەتی زۆری پێدەخۆن ونارەحەت دەبن کە کوڕەکەیان ئاوا دەرچووە! لە کاتێکدا لە کاری چاکەدا واجبە گوێڕایەڵی دایك وباوك بکات، بەلاّم لەو چاکەیەشدا گوێڕایەڵ نییە! ئەگەر تەنها لەبەر ئەم بێ لەڕمانیەی تاوانبارێیت، بەسە بۆ ئەوەی کە بگوترێت جگەرە حەرامەو بۆتە هۆی ئەنجامدانی تاوانە گەورەکان، الکبائر.

[٥١] چۆن دەبێت ئافرەتی ژیر بەوە هەڵبخەڵەتێت، هیهات هیهات.

بەڵام من وتم کەمی دەکەمەوە هەفتەی دواتر واز ئەهێنم، کەچی هەر فـێڵم لەخۆم دەکردو دەمگوت ئەها فـلان دکتـۆریش ئەیکێـشێت، بـەڵام خـۆ لـە وڵاتی ئێمەدا بڕوانامە پێوانەی ژیری نییە، نەمدەزانی کە دکتۆرەکە زۆر لە من بیٚ ئەقلٚ ترە.

لەم دواییەدا توشی تەنگەنەفەسـی بـووم و تەنانـەت وازم لـە پیاسـەکردن لەگەڵ هاوڕێکانم هێنا و هەر وازم لەتۆ نەهێنا، جگەلـەوەش هـەرگیز بـیرم لـەوە نـەدەکردەوە کـە تاکـە بەرهـەمێکی پیـشەسازی زیانـەکانی لەسـەر پاکەتەکەی بنوسێت تۆی، هیچ بیریشم لەوە نەدەکردەوە کە ئەو پارەیەم لەچیدا خەرج کردووە ، جا ئەگەر تەنها جارێـك بـیرم بکردایەتـەوە ئـەبوم بەهاوڕێی تۆ؟ ئائێستا زۆر پەرشیمانم لە هاوڕێیەتی تۆ بەڵام سـودی چـی یە؟ ئەوکاتەی توشی شێرپەنجەی سییەکان هـاتم و سـادەترین مـاف کـە هەناسەدانە لێم کەم کرایەوە و خۆشەویست ترین ژیان کە هاوڕێیەتیە لـێم دوورخرایەوە، ئەوە چ حاڵەتێکە؟

خۆزگەم بەوڕۆژانەی کە بۆنی شیری دایکم لەدەمم ئـەهات، ئێـستا هـەمان دەم بـۆنی بۆگـەنی لێـدێت.. ئـەبێ ئێمـە وڵاتێکـی زۆر دەوڵەمەنـد بـین پێویستمان بە هیچ نەبێت جگە لەتۆ... بۆنی تۆ بۆنی مەرگەو منیش بۆنی تۆم گرتووە، بەڵام بەڵێن بێـت تـا مـابم لەژیانـدا ئامۆژگـاریی هـاوڕێ کـانم بکەم کە من بوم بەپەند بۆیان و ئەوەی ژیر بێت نابیٚ ئیتر ناویشت بەریٚ، لەکۆتایدا تۆبویت بەڕابوردوو ڕابردووش بوو بە پەڵەیـەکی ڕەش بـە سـییە کانمەوە...

# بەشی حەوتەم :لەكۆتایی دا

لەكۆتای ئەم نوسینەدا دووپەیام دەگەیەنم بەموسوڵمانانی خۆشەویست:

پەیامی یەكەمم:

بۆمامۆستایانی بەڕێزوگشت ئەوانەی كەلەناوخەڵكیدا بەپیشەواناسراون وخەڵكی چاویان لێدەكەن !!!تكایە مەبنە هۆكاری ڕێخۆش كردن بۆئەنجام دانی خراپە كاری،بەوەی كە_خوانەخواستە _كارێكی خراپ ئەنجام بدەن وبیدەنە بەڵگە بەدەست كەسانێكی نەزانەوە لەسەر بەردەوام بوون لەسەرتاوان وخراپە،مامۆستایانی ئاینی بەڕێز......پێویستەزۆر خۆبپارێزن لەپێچەوانەی شەرعی خوا چونكە خەڵكی شوێنتان دەكەوێت وچاوتان لێدەكات ،مامۆستایانی بەڕێز فەرمانی چاكە بەخەڵكی دەدەن ودەڵێن:خەڵكینە شوێن پێغەمبەرﷺبكەون لەكارو بارەكانتان دا...لەهەموكارەكانتاندا شوێنی بكەون ...بەڵام دەبینی _مامۆستا بۆخۆی لەشێوەو ڕوخساریداپێچەوانەی سوننەتی بەئاشكرا پێوە دیارە!!!!!،دەبینی پۆشاكەكەی درێژە یان ڕیشی تاشیوە.....،پێویستە لەپێشدا مامۆستایان وشارەزایان خۆیان چاكتربكەن تاخەڵكیش چاویان لێبكەن ،گەر مامۆستایەك جگەرە دەكێشێت وازی لێبهێنێت و تەوبە بكات نەبێتەپێشەوای خراپ بۆخەڵكی ،یان فەتوای هەڵە نەدات كەجگەرە كێشان حەڵاڵەیان هیچی تیانیە یان كەراهەتی هەیە......!!!

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت ﴿من أفتى بغير علمٍ كان إثمُهُ على من أفتاه...﴾ ([52])

واتە: هەرکەسێك فەتوابدات بەبێزانستی شەرعی ئەوەتاوانی ئەو کەسەهەڵ دەگرێت کەفەتوای هەڵەی بۆداوە.

هەروەها لەفەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت ﴿من دعا إلى هُدىً كان له من الاجر مثل أجور من تبعه لاينقص ذلك من أجورهم شيئاً ومن دعا إلى ضلالةٍ كان عليه من الأ ثم مثل آثام من تبعه لاينقص ذلك من آثامهم شيئاً﴾ ([53])

واتە: ﴿هەرکەسێك بانگەواز بکات بۆهیدایەت _بۆرێگەی ڕاست_ ئەوە پاداشتی بەقەدئەوانەهەیە کەشوێنی دەکەون _لە وچاکەیەدا_ بەبێ ئەوەی لەچاکەکە ی ئەوان کەمبێتەوە ،وەهەر کەسێك بانگەواز بکات بۆ گو مڕای وسەر لێشێواوی _خراپە کاری_ ([54]) ئەوە تاوانی بەقەدتاوانی ئەوانەهەیە کەشوێنی دەکەون_لەو خراپەیەدا_ بەبێ ئەوەی لەتاوانی ئەوان کەم بێتەوە ([55])﴾

ئەوەی پێویستییەکی گرنگە کە مامۆستایانی بەڕێز زۆر بەووریاییەوە ئاگاداری کردارو گوفتار یان بن تاسەر فرازی دنیابن وببنەپێشەوای

---

[52] أخرجه أبوداودوالحاكم عن إبي هريرة،المشكاة/٢،وفي صحيح الجامع-٦٠٦٨-قال الأمام الألباني-حديث حسن-

[53] أخرجه أحمدفي المسندومسلم في صحيحه وأبي داودوالترمذي والنسائي وإبن ماجة عن إبي هريرة،مختصرصحيح مسلم للألباني/١٨٦٠،الدارمي،إبن أبي عاصم في السنة/١١٣،وفي صحيح الجامع /ج٢/ص/١٠٧/رقم ٦٢٣٤

[54] ئەوکەسەی کەجگەرەدەکێشێت ئەویەئاشکرا کێشانەش بانگەواز کردنێکە کەخەڵکی چاوی لێبکەن جابزانن یان نا!!!

[55] هەندێك خۆدەخەڵەتێنن دەڵێ لەفڵان مامۆستا م پرسیوە گوتویەتی جگەرەکێشان حەرام نیە! ادەی تاوانەکەم بەملی ئەو من تاوان بار نیم! !نەخێر وانیە هیچ کەس تا وانی کەسێکی دی هەڵ ناگرێت – ولاتزروازرةوزرةأخري –ئەو بەقەدتۆ تاوان باردەبێت بێ ئەوەی لەتاوانی تۆ کەم بێتەوە!!!!!

خەڵك لە خێروچاكەداو خوایش لێیان خۆش ببێت لەدوا ڕۆژداو لەجێ بەجێ كردنی شەرعی خوادا لەلۆمەی لۆمە كاران سڵ نەكە ینەوە بەڵكو بترسین لە گۆڕێكی تاریك وقیامەتێكی سەخت!!!

بزانە كەپێغەمبەری خواﷺدەفەرموێت{كل بني آدم خطاء وخير الخطــائين التوابون}

رواه أحمدفي مسنده،والترمـذي، وصـححه الألبـاني في صـحيح وضـعيف الجامع(٨٦٤٤_٤٥١٥)الألباني..

واتــە:﴿هــەموومرۆڤێك هەڵــەدەكات چــاكترین هەڵــەكارانیش ئەوانــەن كەپەشیمان دەبنە وە—لەوهەڵەیەی كەلەپێش دائەنجامیان داوە—﴾

## پەیامی دووەمم:

بۆ گشت برایانی موسوڵمانم كەتوشی ئەو دەر دەبون _جگەرە كێشان _واز بهێنن ودەست هە لگرن و تەوبە بكەن وبگە ڕێنەوە لای خوای گەورە چونكە زۆرلێخۆش بوو میهرەبانە،نەفستان بگرن لەئاستی حەرام دا تاپاداشتی _مجاهد_ تێكۆشەرتان دەبێت لەلای خوا!!ئەرەتەپێغەمبەرﷺدەفەرموێت ﴿أفضل الجهاد أن يجاهد الرجل نفسه وهواه﴾(٦١)

واتە:(چاكترین تێكۆشان _جیهاد_ئەوەیە كەكەسێكتان تێبكۆشێت لەگەڵ هەواو ئارە زوی دا)

[61] سلسلة الصحيحة/١٤٩٦/صحيح الجامع/ج٢ص٢٤٧/رقم :١٠٩٩

واتە: شوێنی هەواو ئارەزوی خۆی نەکەوێت لەپێچەوانەی شەرعی خوادا.

تەوبە کردن لەهەمووتاوانێك وەر دەگیرێت مادام لەکاتی غەرغەرەی مردن دانەبێت یان لەکاتی هەڵ هاتنی خۆردا نەبێت لە خۆر ئاواوە _کەنیشانە یەکی گەورە ی قیا مە تەونیشانەیەبۆ کۆتایی هاتنی دوونیا_پێغەمبەری خواﷺدەفەرموێت﴿من تاب إلى الله قبل ان يغر غـر قبل الله منة﴾(٥٧)وەلە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت ﴿من ناب قبـل أن تطلع الشمس من مغربها تاب الله عليه﴾(٥٨)

جابرای بەڕێزم :ئەگەر بەدوای ژیانێکی خۆشی دونیاودواڕۆژێکی هەتاهەتایادەگەڕێیت ئەوەتەوبەبکە: چونکە

أ_تەوبە کردن گوێڕایەڵی خوایە _سبحانە وتعالی_چونکە فەرمانی کردووەو فەرموویەتی :{ياأيها الذين آمنوا توبوآإلى الله توبة نصوحا}(٥٩)

واتە:(ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە !بگەڕێنەوە بۆلای خوا بە تەوبەو گەڕانەوەیەکی ئێجگاری ،واتە:بەشێوەیە ك ئیتر جارێکی تر نەگەڕێنەوەسەر ئەو تاوان و گوناهانە،لەئیمامی عمری کوڕی خەتتابیان پرسی -رضي الله عنە _تەوبەی نەصوح چیە_!؟

---

٥٧ اخرجة أحمدفي المسند والترمذي وابن حبان والحاكم ،الترغيب/٢٣٤٣،صحيح الجامع/ج٢/رقم:٦١٣٢:قال الأما م الألباني:حديث صحيح

٥٨ مختصر مسلم للألباني/١٩٢٠-أخرجة مسلم في صحيحية/٢٧٠٣،صحيح الجامع /ج٢/رقم ٦٣٣

٥٩ سورة التحريم/٨-قال السعدي -رحمة الله-:(والمرادبها التوبة العامة الشاملة للذنوب كلها التي عقدها العبد لله لايريد بها الاوجهه والقرب منه ويستمر عليها في جميع احوالة)

فەرمووی:_نەصوح_(ئەوەیە کەئەوکەسە تاوان کارە لەتاوانەکانی پەشیمان ببێتەوەو جارێکی تر نەگەڕێتەوەسەریان چۆن شیر هەرکە لەگوانی ئاژاڵ هاتەدەروە جارێکی ترناگەڕێتەوە ناو گوانی ).

وەخوای گەورەدەفەرموێت_سبحانه وتعالى_{وتوبوآإلى الله جميعاًأيـة المؤمنـون لعلكم تفلحون}([60])

واتە:(ئەی باوەڕداران هەمووتان بەرەو لای خوابگەڕێنەوەو پەشیمان ببنەوەبەڵکو سەرفراز ببن _لەدونیاو دوارۆژدا_).

هەندێك كەس لەموسوڵمانان بەهەڵەتێگەیشتون :گەر پێیان بگوترێت تەوبە بکە وبگەڕێرەوەبۆلای خوادەڵێ:خۆمن کافر نیم! ! !دەی ئەوەتە خوای گەورەفەرمان بە ئیماندارن دەکات تەوبە بکەن! !ئەوەتەپێغەمبەری خواش ﷺڕۆژی ٧٠بۆ١٠٠جار داوای لێبوردن و–استغفرالله–ی دەکردلای خوا! !خۆتەوبە بەس لەکوفرناکرێت لەهەمووگوناهێك تەوبە دەبێت بکرێت بچوك بێ یان گەورە.

ب_بزانەبەتەوبەکردنت دەبیتەخۆشەویستی خوای گەورە_خوای گەورەدەفەرموێت:{إن الله يحب التوابين}([61])

واتە:(بەڕاستی خواو کەسانەی خۆش دەوێت کەلەگوناه پەشیمان دەبنەوەوتەوبەی لێ دەکەن)،لەوەخۆشتر چیەکەپەروەردگاری ئەرزوئاسمانەکان خۆشتی بوێت بەهۆی تەوبەوگەڕانەوەوەئایا ئەوەلەدەستی خۆت دەدەیت؟؟بێگومان کەسی ئاقڵ پەلەدەکات لەتەوبەداکردندا.

ج–ئایازانیوتەکەتەوبەکردن هۆکارێکەبۆبارانبارین وزیاتر بەهێزبون وپێبەخشینی منداڵ وسەروەت وسامان؟

---

[60] سورة النور /٣٢

[61] سورة البقرة/٢٢٢

خوای گەورەباسی پێغەمبەرنوح عليه السلام دەكات كەبەقەومەكەی خۆی دەگوت {فقلت استغفروا ربكم إنـــه كـــان غفاراًيرســـل الـــسماء علـــيكم مدراراً،ويمددكم بأموال وبنين ويجعل لكم جنات ويجعل لكم أنهراً}[62]

واتە: {نوح پێغەمبەر عليه السلام:بەقەومەكەی فـەرموو:داوای لێخۆش بـون لەپەروەردگارتان بكەن چونكە هەمیشە گوناه پۆشە_ئەگەرئێوەمل كەچی فەرمانـەكانی خـوابن وبـڕوابهێنن ئـەوە_خـوای گـەورەپێنج شـتتان پـێ دەبەخشێت:١-بارانتـان پەیتاپەیتاوبەلێزمـە بۆدەبارێنێـت،٢-٣-وەدارای وكوڕی زۆرتان پـێ دەبەخشێت كەئەودووشـتەلەناوجۆرەمرۆڤێكدا مایـەی سـەروەرین، ٤-چـەندین باخـات وبێـستانتان دەداتـێ كـەجوانترین هـۆن بۆخۆشی گەلان،٥-ئاوو ڕووباری زۆریشتان بۆبـەدی دێنێـت كەلـەژێرینكی درەختەكانەوە ئەوچەمەئاوەدێ ودەڕوات}

بۆیەزانایان كاتێك پرسیاریان لێ دەكرێت كەكەسێك حـەز دەكـات منـداڵی ببێـــــت چـــــی هۆكارێـــــك بگرێتەبـــــەر؟پێی دەفـــــەرموون _زۆرتەوبەبكـەزۆر_أســـتغفرالله_بكـە وەك جـۆن پێغەمبـەرنوح عليه السلام بەقەومەكەی ڕاگەیاند!!!

د-ئایازانیوتەكەهەركەسێك تەوبە بكات لـەتاوانێك ئەوەنـەك هـەرخوا لێـی خـۆش دەبێـت بـەڵكو خراپەكانیـشی بۆدەگۆڕێـت بەچـاكە _بەمـەرجێك تەوبەیەكی ڕاست ودروست بێت ونەچێتەوەسەرتاوانەكانی پێشوی.

---

[62] سورة نوح/١٠-١٢

خـوای گەورەدەفـەرموێت ﴿إلامن تاب وآمن وعمل صلحاً فأولئك يبدل الله سيئاتهم حسنت وكان الله غفوراً رحيما ومن تاب وعمل صـــالحاًفإنه يتوب إلى الله متاباً﴾(٦٣)

واتە:(مەگەرکەسێك پەشیمان دەبێتەوەوبڕوابێنێ وکاری چـاك ئـەنجام بـدا ئائەوکـــــــە ســـــــــانەخواگوناهوخراپەکانیان بۆدەگۆڕێــــــــــت بەچاکەوەهەمیـشەخواگوناه پـۆش ومیهرەبانـە وەئـەوەی لەگوناهـەکانی تەوبەی کردو کردەوەی چاکی کرد،ئەوەبەڕاستی زۆربەمەزنی دەگەڕێتەوە بۆلای خوا).

و-خوای گەورەبانگی هەموبەندەکانی خۆی دەکات کە بـێ هیوامـەبن لـە ڕەحمەتی خواودەفـەرموێت﴿قل يعبادي الذين أسرفواعلي أنفسهم لاتقنطومن رحمةالله إن الله يغفرالذنوب جميعاًإنه هوالغفورالرحيم﴾(٦٤)

واتە:(ئەی پێغەمبـەر ﷺ!لەمنـەوەبڵێ:ئـەی بەنـدەکانی مـن ئـەی ئەوانـەی ستەم وزیادەڕۆییتان لەخۆتان کـردووە!ئێوەلەڕەحمـەت ومیهرەبـانی خـوا بـێ ئومێدمـەبن بەڕاسـتی خوالەهـەموگوناهێك خـۆش دەبێـت_هەرچـی بێت،شیرك،کوشتن،زیناکردن،ڕیبا خواردن،ستەم کردن.......،تاوانی بچوك وگەورە_ئەگەرچی گوناهەکانیان بەقەدکەفی سەردەریابێت یـان پڕبـەزەوی وئاسمان بێت چونکە ئەو_خوایە_لێبوردەومیهرەبانە).

جاتەوبەبکەوبگــەڕێرەوەلای خــوای خــۆت مەخەڵەتێنــە بڵێـــی خواغـەفورو ڕەحیمـە_بزانـە_شـــــديدالعقاب _یــــشە_بۆتـاوان بـاران

---

[٦٣] سورةالفرقان/٧٠-٧١

[٦٤]/ سورة الزمر ٥٣

خۆئەگەرئەوخەڵکەتەوبــــەبكات خـــــواپێی خۆشەوبۆخۆیــــــشیان چاكە،خۆئەگەرهەمووخـەڵكی لەسـەرڕێگەی خوابێـت خـوای گەورەسـودی پێناگات! !،وەئەگەرهەمووخەڵكیش كافر بن خـواهیچ زیـانی لـیّ ناكـەوێت وپێویستی بەهیچ شت وهیچ كـەس نیەوبێنیازەلەهەمووشـت! !بـەڵام پێـی خۆش نیەبەندەكانی كافرین! ! ! كەس بەوە فریـو نـەخوات بڵـیّ :بۆفلانـە وولات ئـاواو ئـاوان تـاوان دەكــەن وبــیّ بـاوەڕن وهــەرخواپیّ یـان دەبەخشێت.... ! ! ! دلنیابەئەوە_إستدراجة_بەوهۆیەوەخوای گەورەوایان لێـدە كـات زیاترغافـلّ بـبن ودوای لـەپڕدادەیانگرێت ولـەناویان دەبـات، هـــەروەك لەقەومـــەكانی پێـشودا ڕویـدا.. ! !بۆئەوجۆرەكەسانەچـاویان داخـستووە لەئاسـتی ئەوهـەموو بەڵگـەدا كـەخوای گەورەهەرچەندسـالّ جارێك ولاتێك سزادەدات بەهۆی تاوان یانەوە...! ! !بۆكارەساتی سۆنامی وئەمریكاوئێران_شاری بەم _وتوركیاوڕوسیاو_كارەساتەكەی ئـەم سـاڵی هـایتی لەبیربكـەین ....! !لەچـەند چـركەیەكی كەمـدا بەهـەزاران لاشـە كەوتنـــە ژێرداروبەردولـــەئاودا خنكـــان...بەســـەدان هـــەزار برینـــدارو ئاوارەبوون....جابۆیە چەندبارەی دەكەمەوەدەڵێم تەو بەبكـە بـەبیّ هـیچ گومانێـــك بەڕاســـتی تەوبەبكـــە نـــەك هەرلەجگـــەرە كێـــشان بەڵكولەهـــەمووتاوانێك ! !چـاك بزانــە خــوای گەورەدروســتی كردویــت هەناسەكانت دیاری كراوە سەعاتە كانـت دیـاری كـراوە،پـێش ئـەوەی دلّ لـەكار بكـەوێت پـێش ئـەوەی نامـەی كـردارت دابخرێـت تەوبەیـەكی تێـدا تۆماربكە! !كاتێكت زانی لەسەرەمەرگدایت وپەشیمانی دادت نـادات،وەك خوای گەورەدەفـەرموێت﴿حتى إذا جاء أحدهُمُ الموتُ قال رب ارجِعُونِ لعلي

آعمل صالحاًفيما تركتُ كلاًّإنها كلمةهو قائلها ومن ورائهم بــرزخٌ إلي يــوم يبعثو ن﴾المؤمنون(٩٩_١٠٠)

**ئەمەكۆتای باسەکەمان بوولەسەرجگەرەکێشان بۆئەوەی بەڵگەیەك بێت لەســەرئەوانەی کەتائێــستانەیان بیــستوەیان نەگەیــشتونەتەقەناعەت کەجگەرەحەرامــە،وەرێنیــشاندەریش بێــت بۆئەوانــەی کەگوێرایــەڵی شەرعن........**

**هەوڵ بدەئەم نوسینە بڵاوبکەیتەوەوبیگەیەنیتەدەست ئەوانـەی کەدەیانـەوێت بگەنەقەناعـەت لەســەرحوکمی جگەرەکێـشان _ بەتایبــەت گـەنجان و_شـی کردنەوەوتێگەیانــدنیش لەســەرتانە بۆبەتەمەنــەکان پیــاو بێــت یــان ئافرەت،پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت﴿من دل علي خير فله أجرفاعله﴾[٦٥].**

**واتـە:(هەرکەسێك رێنیـشاندەری کەسێك بێـت بۆکـاری چـاکەبەئەندازەی چاکە کارەکە خێری بۆدەنوسرێت).**

**خـوای گـەورە ئـەم ئامۆژگەریانـەمان لێوەربگرێـت وببێتەرێنیـشان دەرو ڕونکردنـــەوە بۆهەموئەوبرایانـــەی کەتوشـــی ئـــەم دەردەبـــون کەجگەرەکێــشانە،وەخـــوای گـــەورە پارمـــەتی هەمولایـــەکمان بـــدات لەسەرخێروپارمەتی ئەوانیش بدات بۆتەرك کردنی ئەو کارەحەرامـە،خـوای گەورەإخلاەـمان پـێ ببەخـشێت ولەقــەبری تاریـك وقیامــەتی ســەخت بەفریامان بێت....﴿آمين﴾**

---

[٦٥] أخرجه أحمد ومسلم في صحيحة وأبي داود والترمذي عن إبن مسعود،المشكاة/٢٠٩،صحيح الجامع /ج٢/ص١٠٧-رقم-٦٢٣٩

## لا تنفع الشمس أعمى

١- ولا ينفع مطبوع إذا لم يك مسموع

٢- ولا ينفع مسموع إذا لم يك مطبوع

٣- كما لا تنفع الشمس ونور العين ممنوع

ديوان الامام الشافعي رحمه الله

ص٦٤/ جمع وترتيب مختار فوزي النحال

مادعوةأنفع ياصاحبي من دعوةالغائب للغائب

ناشدتك الرحمن ياقارئاً أن تسأل الغفران للكاتب

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ان لاإله إلا انت أستغفرك واتوب اليك

كتبه الفقير الى عفو ربه

**زانا عثمان بينجويني**

# زیانەکانی جگەرەکێشان
# و
# حوکمی
# کڕین و فرۆشتنی

**مامۆستا عبدالکریم**

پێشنوێژو ووتار خوێنی

مزگەوتی ئیمان

لە

سلێمانی

وتاری ڕۆژی هەینی ٢٠١٠-٤-٣٠

**تێبینی:**

**١- ئەم وتـاره بـە دەنـگ و ڕەنـگ لـە تۆمارگـەی سـونە دەسـت دەكـەوێت. (سلێمانی، شەقامی مەولەوی، بازاڕی کەنار).**

**٢- پرس کراوەبە مامۆستای خۆشەویـست ،ڕازی بووەلەسـەربڵاوکردنەوەی خـوای گەورەبەردەوامی بەئێمەش وبەبەڕێزیشیان ببەخشێت لەسەر خێر.**

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحَـــمْـــدَ لله نَحـْمَـدُهُ ونَـــســْـتـَعِــيــنُـهُ ونَـسْـتَغْـفِــرُهُ ونَـعُوذُ بالله مِــن شـُــرُورِ أنفـُـسِـنَا وسَـيِّـئَاتِ أعـمَـالِـنَـا مَـن يَهْدِهِ الله فلا مُـضِـلَّ لَـهُ ومَـن يُـضْلِـلْ فـلا هَـادِيَ لَـهُ، وأشْـهَـدُ أن لاَ إلَهَ إلاَّ الله وَحـْدَهُ لاَ شَـرِيكَ لَـهُ وأشْـهَـدُ أن مُحَـمَّـداً عَـبْـدُهُ وَرَسُـولُـهُ.

[ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ] [ آل عمران:١٠٢] .

[ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا] [النساء:١]

[ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ( * ) يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا] [الأحزاب: ٧٠ــ٧١].

أمـَّـا بَـعْـد ،

فَـإنَّ أصـْدَقَ الحَـدِيثِ كِـتَـابُ الله وَخـَيـْرُ الهـَدْيِ هَـدْيُ مُـحَـمَّـدٍ صَـلَّـى الله عَلَـيْهِ وآلِهِ وَسـَلَّـم، وَشَـرَّ الأمُـورِ مُـحْـدَثَـاتـُهـَا وكُـلَّ مُـحْـدَثـَةٍ بِـدْعـَةٍ ، وكُـلَّ بِـدْعَـةٍ ضَـلاَلَـةٍ ، وَكُلَّ ضَـلاَلَـةٍ فـي النـَّـار .

﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾

﴿ شته پاكه‌كانيان بۆ حه‌لاڵ ده‌كات و شته پيسه‌كانيان لێ حه‌رام ده‌كات﴾

﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾

﴿نه‌كه‌ن خۆتان بكوژن ﴾

﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾

﴿ بەدەستی خۆتان خۆتان بەرەو تیاچون مەبەن ﴾

موسوڵمانانی خۆشەویست! موسوڵمانی تەواو ئیمانداری ڕاست لەگەڵ خوادا، کەسانێکن کە گوێیان لە ئەمری خواو ئەمری پێغەمبەر بوو(صلى الله عليه وعلى آله وسلم)، گوێڕایەڵی بکەن، ئەوە بەڵگەی ئیمانێتی بە خوا، بەڵگەی ئیمانێتی بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وعلى آله وسلم) وە بەڵگەی ئیمانێتی بە فەرمودەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وعلى آله وسلم). بەڵام ئەوەی ئەیبیستێت و لێی تێئەگات و کردەوەی پێناکات، بێ گومان ئەوە کەسێکە ڕاست ناکات لەگەڵ شەرعی خوادا، خوای گەورەو میهرەبان لە زۆر ئایەتی قورئاندا باس لە سیفەتەکانی پێغەمبەر دەکات(صلى الله عليه وعلى آله وسلم) ئەو سیفەتەی کە خوای گەورەو میهرەبان باسی دەکات و مەبەستمانە ئەمڕۆ باسی بکەین ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ﴾ ئەوەی کەوا پاک بێت لە شەرعی خوادا، ئەوانەش کەوا لەسەر پاکێتی ئیسلام مابن، ئەوانەی کە عەقڵیان لە دەست نەدابێت، ئەوەی پاکە بەلایانەوە چاکە.

﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ ئەوەشی کەوا پیسە، زیان بەخشە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وعلى آله وسلم) شەرعی خوای گەیاندووە کە ئەوە حەرامە، خۆتانی لێ بەدور بگرن، ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ واتا ( ما استخبثه الشرع ) ئەوەی کە شەرعی خوا بەپیسی بزانێت، ئەوەی کەوا پاکە لە خواردن لە خواردنەوە لە قسە لە کردەوە نیکاحی شەرعی، ئەوە خوای گەورە حەڵاڵی کردووە، ئەوەیشی کەوا پیسە خواردن بێت خواردنەوە بێت، هەرقسەو کردارێکی پیس، ئەوا خوای گەورەو میهرەبان حەرامی کردووە، وە پێغەمبەر(صلى الله عليه وعلى آله وسلم) بە پیسی داناوە، جا لەو پیسانە، لەو حەرامانە بریتییە لە جگەرەکێشان.

بە ئومێدی خوای گەورەو میهرەبان ئەوانەی کە تـوش بـوون لـە تەمەنـدارەکان دوای بیستنی ئەم ڕاستییە لە شەرعی خواو لە زانستی طب دا، تەوبـە بکـەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا.

ئامۆژگاریشە بۆ گەنجەکانمان ئەوانەی کـەوا تـازە پێدەگـەن، ئـەو جوانێتیـەی خۆت ناشیرن مەکە، پاکوخاوێنی خۆت ڕاگرە، چـونکە پێغەمبـەرەکـەمان(صلى الله عليه وعلى آله وسلم) بەردەوام پاکوخاوێن بووە لە پۆشاکیدا بەردەوام پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وعلى آله وسلم) بۆنی خۆشی بەکار هێناوە.

**لە وانەی کەوا پیسە حەرامە بریتیە لە جگەرەکێشان** ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ جگەرەکێشان لە پیسەکانە زیان بەخشە بۆ هەموو مرۆڤێك، ئەو بۆنە پیسەی کە ئەوەی فێر نەبوبێت چەند بێ تاقاتە پێی!.

پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وعلى آله وسلم) نەهی دەکرد دەیفەرموو لە کاتێکدا ئێوەی موسوڵمان دێن بۆ مزگەوت (پیاز یان سیر) مەخۆن، کە حەلاڵیشە بەلام بۆ ئەو شوێنە بۆ ناو ئەو کۆڕە نابێت بیان خۆیت! ئەگەر خواردت گوناه بارێت. ئیمامی عومەر ڕەزای خوای لێبێت ئەوانەی(پیاز و سیریان بخواردایە) دەریدەکردن بۆ بەقیع، نەك نزیکی مزگەوت ببنەوە. ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾.

وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾، (بە دەستی خۆتان خۆتان بەرەو تیاچون مەبەن) تیاچون ئەوەیە ئەوەی کەوا فەرز بێت جێبەجێی نەکەیت وە ئەوەی حەرامە بیکەیت ئەوە (تالوکەیە). بێ گومان جگەرەکێشانیش لەناوچونە، بەدەستی خۆت خۆت بەرەو تیاچون دەبەیت، ئەو نەخۆشیە کوشندانەی کە هەیەتی کە توش دەبێت و هەموتان دەزانن نەخۆشی (سرطان) شێرپەنجە، پارەیەکی زۆر سەرف دەکەیت کە توشی ئەو نەخۆشییە بویت، بۆ ئەو وڵات و بۆئەم وڵات، خەمی خۆت بخۆ پێش ئەوەی ماڵت

بەزایەبدەیت، ﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ﴾ خوای گەورەو میهرەبان دەفەرمویێت خۆتان مەکوژن، جگەرەکێشانیش وردەوردە بەرەو کوشتن و تیاچونە، دەبێت ئاگات لێبێت، سەر دەکێشێت بۆ مردن بەڵام مردنێکی لەسەر خۆ وردەوردە بە هۆی ئەو ماددە پیسەی کە تێیدایە کە بریتیە لە (نیکۆتن). ئەوانەی کەوا فێربوون بەهۆی ئەو ماددەیەوە دەڵێن بۆمان تەرك ناکرێت، مەشروب خۆرێکیش هەروا دەڵێت، دەڵێت بۆم تەرك ناکرێت، کەواتە ماددەیەکی تێدایە خەڵك بەرەو سەرخۆشی دەبات، خەڵکی وا لێدەکات بەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ نەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا (*) إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ﴾ ئەگەر دینارێکیش بێت لە حەرامدا سەرف بکەیت (تبذیر)ە ، هەمو ماڵت لە حەڵاڵدا سەرف بکەیت ئیسراف نییە! بەڵام یەك دینار لە حەرامدا سەرف بکەیت (تبذیر)ە، ئەوانەش کەوا تەبزیر دەکەن واتا ماڵیان لە حەرامدا سەرف دەکەن ئەوانە وەك شەیاتنی وان، لە خراپەکاریدا پێش هەمووکەس زیان بە خۆیان دەگەیەنن، وەکو چۆن شەیتان زیانی بە خۆی گەیاند، پاشان زیان بە خەڵك دەگەیەنێت بە بڵاوکردنەوەی فەساد لەناو خەڵکدا ئەوەش سیفەتی شەیان بوو، ئەوەیش تەوبەی لێ نەکات لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ شەیتاندا لە ناو ئاگردا دەبێت، ﴿وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا (*) إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ﴾. ئەو پارەیەش کە جگەرەی پێ دەکڕیت حەرامە، وە ئەو کەسابەتەش کە بریتیە لە کڕین و فرۆشتن بە جگەرەوە حەرامە، هەرهەموی لەسەرەتای تۆوەکەیەوە هەتاوەکو دەگاتە سەر، هەر هەموی حەرامە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وعلى آله وسلم) فەرمویەتی (لا ضرر ولا ضرار) واتا دروست نییە بۆ هیچ کەسێك زیان لە خۆی بدات، جا ئیتر مەبەستت بێت یان مەبەستت نەبێت (و لاضرار) وەدروستیش نییە بە ئەنقەست زیان بە خەڵکی بگەیەنیت،

بێ گومان ئەوەی کەوا جگەرە دەکێشێت پێش هەموو کەس زیان بەخۆی دەگەیەنێت، پاشان بەمەبەستەوە دەزانێت کە ئەو جگەرەکێشانەی لەو شوێنەدا ئەو خەڵکە ناڕەحەت دەکات کە لەگەڵ ئەودا دانیشتون کەواتە مەبەستێتی ئەو خەڵکە ناڕەحەت بکات و زیانی پێ بگەیەنێت و ناڕەحەتی بکات، ئەوە فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر(صلی الله علیه وعلی آله وسلم) لەصحیح الجامع(٦٨٣٥).

جگەرەکێشان زیان گەیاندنە بەخۆت، زیان گەیاندنە بەخێزانت، بەمنداڵت بە ڕەفیق و برادەرت، بەتایبەتی ئەگەر لەشوێنێکی گشتیدا بێت یان لە ناو پاسێکدا یان لە ژورێکدا. بە داخەوە زۆر جار دەبینین لە شوێنە گشتییەکاندا نوسراوە (**جگەرەکێشان قەدەغەیە**) کەچی ئەوانەی کە کارمەندن لەوشوێنەدا خۆیان جگەرە دەکێشن، لە پشتی سەرێوە نوسراوە (**جگەرەکێشان قەدەغەیە**).

بەوەش هەڵنەخەڵەتێن کە مامۆستایەکی ئاینی جگەرەبکێشێت یان دکتۆرێك جگەرەبکێشێت، بەوەهەڵمەخەڵەتێن.

وە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وعلی آله وسلم) فەرمویەتی ( وَمَنْ شَرِبَ سُمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا)([٦٦])(رواه مسلم) ئەو جگەرەکێشانە زەهرە نیکۆتین لەو ماددانەیە کە زەهری تێدایە، کەواتە دەبێتە هۆی کوشتنی خۆت، بەکێشانی ئەو ماددانەی کە زەهراوین نەفسی خۆت لەناو دەبەیت، خۆت دەکوژیت، لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە بەوە سزات دەدات لەناو ئاگری جەهەنمدا پەنا بەخوا. جگەرەکێش وردەوردە خۆی بەرەو تیاچون دەبات زوبێت یان درەنگ.

---

[٦٦] بەم شێوانەش دەخوێندرێتەوە (سَماً ، سِماً).

وه پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وعلى آله وسلم) فەرمویەتی: (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُؤْذِي جَارَهُ) (رواه مسلم) (هەرکەسێك بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە با ئازاری دراوسێکەی نەدات )، ئەو هەموو دوکەڵە دەکەیت بەسەریدا! کەی ئەوە سیفەتی ئینسانێکی موسوڵمانە؟ کە گوێڕایەڵی شەرعی خوابێت، نابێت وابێت.

وه پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وعلى آله وسلم) فەرمویەتی: (لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ وَعَنْ عِلْمِهِ مَا فَعَلَ بِهِ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَهُ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَا أَبْلاَهُ)( رواه الترمذي) لە ڕۆژی قیامەتدا کە خوای گەورەو میهرەبان زیندومان دەکاتەوە، لەشوێنی خۆمان ناجوڵێن (تاکو چوار پرسیارمان لێ نەکرێت) لەو پرسیارانەی کەوا لێمان دەکرێت: ئەو ماڵەی چۆن پەیداکرد؟ بازرگانی بە جگەرەوە کرد. ماڵەکەی لە چیدا سەرف کرد؟ جگەرەی پێ کڕی. لاشەی توشی چ دەردێك کرد؟ سەرەتان. بەهۆی چییەوە؟ هۆکاری سەرەکی جگەرەکێشان.

ئینسانی موسوڵمان هەتاوەکو لاشەی ساغ بێت وە تەمەنی درێژبێت لەسەر خێر باشەبۆی، بۆ لاشەی خۆت دەفەوتێنیت؟ بۆ خۆت توشی ئەو هەموو دەردە دەکەیت؟ بەهۆی حەرامێکەوە کە جگەرەکێشانە؟ حەزناکەیت تەمەنت درێژبێت لەسەر خێر؟ حەز ناکەیت لاشەت ساغ بێت هەتاوەکو بتوانیت بەولاشەساغەت کەخوا پێی داویت زیاتر عیبادەتی خوا ئەنجام بدەیت؟ هەموو ئینسانێکی ژیر پێی خۆشە. دەی حەقی بدە ئەو لاشەت حەقی بەسەرتەوە هەیە! کەواتە پرسیاردەکرێت، ئەوانە ئایەت، ئەوە حەدیسی پێغەمبەر(صلى الله عليه وعلى آله وسلم) ، ئەوە قسەی زانایان: لەوانە حەنەفیەکان: لە کتێبی (الدر المختار) کە باسی توتن دەکات دەفەرموێت: (وهو حرام) حەرامە، شوێن کەوتوانی

ئیمامی شافعی له کتێبی ( بغية المسترشدين ) دهفهرموێت (يحرم بيع التنباك) دهفهرموێت:(کڕین و فرۆشتن به جگهرهوه حهرامه)، حهنبهلیهکان: ههمویان یهك ڕهئن لهسهر حهرامێتی جگهره به تایبهت (الشيخ عبدالله بن الشيخ) (تحريم التتن) دهفهرموێت جگهره حهرامه. مالك یهکان: (الشيخ خالد بن احمد ) (لايجوز إمامة من يشرب التنباك والاستجار به) واتا دروست نییه کهسێکی جگهرهکێش ببێت به پێشنوێژ، ههروهها دروست نییه کڕین و فرۆشتن پێیهوه. حهرامێتی شتێکی ڕوون و ئاشکرایه، لهبهر ئهوهی ئهوسیفهته ئهگهر تائێستا بهخۆی نهزانیوه باچاك بزانێت بهو سیفهته که جگهرهکێشان و حهرامێکه سیفهتێك ئهداته پاڵ خۆی پێی ناخۆشه بهڵام حهقیقهت دهبێت بگوترێت، که ئهو ئینسانه ئهبێت به ئینسانێکی فاسق.

بۆیه زانایان ڕهحمهتی خوایان لێبێت دهفهرمون: ئهگهر توانرا بۆ بنهبڕ کردنی جگهرهکێشان، نوێژ مهکهن له دوای پێشنوێژێکهوه که جگهرهدهکێشێت ههتاوهکو تهرکی دهکات.

گهرچی نوێژکردن له دوایهوه دروسته بهڵام بۆ تهرك کردنی دهفهرموێت دروست نیه بۆ کهسانێك ئهگهر بزانن له دوایهوه نوێژنهکهن ئهویش به خۆیدا دهچێتهوه و تهوبه بکات بگهڕێتهوه بۆلای خوا.

ئهو جگهرهکێشانه لهگهڵ مروئهتی ئینسانی موسوڵماندا ناگونجێت، ئهوانه ههموی بهڵگهی شهرعی وه ئهوهش فهتوای زانایان له ههر چوار مهزههبهکهدا ڕهحمهتی خوایان لێبێت.

داواکارم له خوای گهوره و میهرهبان که ئیسلاحی حاڵمان بکات وه هیدایهتمان بدات بۆ ههمو کردارو گوفتارێکی خێر.

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ ونَعُوذُ باللهِ مِن شُرُورِ أنفُسِنَا وسَيِئَاتِ أعْمَالِنَا مَن يَهْدِهِ اللهُ فلا مُضِلَّ لَهُ ومَن يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، وأشْهَدُ أن لاَّ إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وأشْهَدُ أن مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

اللهم صلي علي محمد وعلى أزواجه وذريته كما صليت على آل إبراهيم و بارك على محمد وعلى أزواجه وذريته كما باركت على آل إبراهيم إنك حميد مجيد.

عیلمی (طب)یش بەوشێوەی کە ڕاستییەکان ئاشکرا کراوە ڕۆژانە (سەد) کەس لە نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەهۆی جگەرەکێشانەوە دەمرن.

ئەو لێکۆڵینەوانەی کە کراون دەربارەی زیانەکانی جگەرەکێشان، تایبەت نییە بەوکەسەی کە جگەرەکە دەکێشێت، بەڵکو ئەگەر لە ژورێکی داخراودابن بۆ ماوەی چوار سەعات لە ژورێکدا دابنیشن، ئەوەیشی کەوا جگەرە ناکێشێت یەکسانە بەوەی کە (دە) جگەرەی کێشاوە، بەهۆی زیانی ئەوانە کە جگەرەدەکێشن بۆئەوانەی کە جگەرە ناکێشن، نەخۆشییەکان زۆرن کە هەموو لاشەی مرۆڤ دەگرێتەوە، لوتی، گوێچکەی، بیستنی، پاشان ئەو کۆکە ناڕەحەتە، وە هەروەها ئەو بەڵغەمە پیسە، زۆری نەخۆشی سەرەتانی زوبان هۆکاری سەرەکی جگەرەکێشانە، کاریگەری لەسەر هەناسەدانیش شتێکی ئاشکرایە، کەئەوانە چۆن تەنگەنەفەس دەبن، نەخۆشی سیەکان ئەوە شتێکی ئاشکرایەو هیچ گومانێك هەڵناگرێت، کە هۆکاری سەرەکی جگەرەکێشانە بۆیە ئەوانەی کە نەخۆش دەکەون خۆشیان چاك دەزانن کاتێك کە سەردانی دکتۆر دەکەن دکتۆر ئەو پرسیارەیان لێ دەکەن کە جگەرەکێشە یان نە؟ پێشتر

جگەرەت کێشاوە یان نا؟ یەکەم شت پرسیاری ئەو دەردەی لێ دەکات، کاریگەری بۆ سەر دڵ کاریگەری بۆ سەر دڵ هەیە، بۆ سەر حەواست، وە ئەوانەی کەوا جگەرەکێشن زوو هەڵدەچن، زوو توڕەدەبن، بەسەر خۆیاندا زاڵ نابن، هەندێك جار لەهۆش خۆیان دەچن بورانەوە پاشان دەست لەرزین زوو توشیان دەبێت، تامکردن: واتا کە بزانن ئەوە ترشە ئەوە شیرینە! ئەوەیان نامێنێت بە هۆی جگەرەکێشانیەوە، کاریگەری لەسەر چاوو بینین، کاریگەری تەنانەت لەسەر ئەوەی کە ئەوانە توشی نەزۆکی دەبن، ئەوانەی کەوا جگەرەکێشن، کاریگەری لە سەر منداڵ کاتێك کە لەسکی دایکدایە، بەوەی کەوا زۆرجار منداڵەکان پێش ئەوەی ماوەی تەواو بکات لەبار دەچێت، یان ئەو منداڵە کە دەکێشرێت وەزنی کەمە، زۆری ئەو منداڵانە بە هۆی جگەرەکێشانی دایك و باوکیانەوە لەمانگی یەکەمدا دەمرن لەسکی دایکیاندا، زۆر لە ڕوخساری ئەو منداڵانەی کە تەشویە دەبێت، واتا کە لە دایك دەبێت ڕوخساری ئاسایی نییە وەکو خەڵکانی تر، بەهۆی جگەرەکێشانی دایك وباوکەوەیە، زۆر لەو منداڵانە لە (بێشکە)دا دەمرن بەهۆی ئەو جگەرەکێشانەی کە دایك و باوکی لەو ژورەدا دەیکێشن، توشبوون بە نەخۆشی ڕەبووە، وەهەروەها کەڕی ئەوانە هەمووی دەردن وە لەگەڵ ئەوەشدا با ئەوەش بوەستێت کە ژینگە چەندە پیس دەبێت، بەهۆی دوکەڵ و بەهۆی جگەرە کێشانەوە.

وتەی کۆتایمان پێتان خۆش بێت یان پێتان ناخۆش بێت! ئەوەیەکە (دەزگای تەندروستی جیهانی) ئامۆژگاری ئەوەیە بۆ دەوڵەتەکان کە چاندنی توتن قەدەغەبکەن، کڕین وفرۆشتنی بە هیچ شێوەیەك پێوەنەکرێت، لەبەر ئەوەی لەسەدا نەوەدی(٩٠٪) نەخۆشی سەرەتان بە تایبەتی سییەکان، بە هۆی جگەرەکێشانەوەیە.

ئەوە هەموی دەردەکانی، ئەوە بەڵگەی شەرعی ئەوە قسەی زانایان، ئەوەیش ئامۆژگاری ئەهلی طب ، بۆ چارەسەری ئەو دەردە، پاشان حەرام بوو خواردت! وە ئینسان ئەگەر خواردن و خواردنەوەو پۆشاکی حەرام بوو خوای گەورەومیهرەبانیش دوعای لێ قەبوڵ ناکات، (وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ وَغُذِّىَ بِالْحَرَامِ فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ ؟ ) چۆن خوای گەورەو میهرەبان وەڵامی دەداتەوە؟ واتا ئەو حەرامانە کاریگەری بۆ سەر هەموو ئەو موسوڵمانانەی کەوا ئیشیان بریتییە لە خواردن و خواردنەوەو پۆشاکی حەرام، دوعایان قەبوڵ نابێت، کە دوعاش قەبوڵ نەبوو پەنا بەخوا ئەوە خەسارۆ مەندییە.

ئامۆژگاریم بۆ هەموو برایانم ئەوانەی کەوا بە تەمەنن وە توشی ئەو دەردەبوون، ئەوە حوکمەکەیتان بیست، لەڕوانگەی شەرعەوەو زیانیشی بۆ لاشەتان ئەوە ئامۆژگاری زانایان وە ئەهلی (طب) ، دەستی لێهەڵگرن با بۆنتان خۆش بێت باخەڵکی حەزکات ڕەفیقیتان بکات با پێیا خۆشبێت لە مەجلیستدا دابنیشن، وە ئامۆژگاریشم بۆ براکانم بۆ گەنجەکان ئەوەیە ئیشتان با لاسایی کردنەوە نەبێت دەبینین کەسانێك کە جگەرە دەکێشن یان لە فیلمێکدا دەیبینیت ، بەوانە هەڵمەخەڵەتێ، خاوەنی کەسایەتی خۆت بە، خاوەنی بڕیاری خۆت بە.

ئەوەی کەوا پیسە شەرعی خوا بەپیسی دەزانێت لەوانە جگەرەیەو جگەرەکێشانەو کڕین و فرۆشتنی هەرهەموی حەرامە، با ئینسانی موسوڵمانیش موسوڵمانێتی خۆی بە کردەوە بسەلمێنێت، ڕاست بکات لەگەڵ خوادا، ڕاست بکات لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وعلى آله وسلم)، تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆلای خوای، بە ئومێدی ئەوەی خوای گەورە ومیهرەبان لە ڕابردوی خراپ خۆش

بێت، داواکارم له خوای گەورەو میهرەبان بەڕەحمی خۆی ڕەحمم مان پێ بکات، ڕەحم بە مردوی موسوڵمانمان بکات، یاڕەبی خوایە عەفومان بکەیت مردوی موسوڵمانمان عەفوبکەیت، خوایەگیان داوات لێدەکەم بە(أسمائك الحسنى و صفاتك العلى) شفای نەخۆشەکانمان بدەیت، ئامین.

خوای گەورە پاداشتی خێری برای بەڕێزو خۆشەویستمان مامۆستا زریان سەرچناری بداتەوە کەهەڵساوە بەنوسینەوەی ئەم ووتارە بەپێزەی بەڕێز مامۆستا عبدالکریم خوای گەورە یارمەتی بدات بۆنوسینەوەی زیاتری ووتارەکانی بەڕێزمامۆستا عبدالکریم إن شاالله. خوای گەورە تەوفیقی هەموولایەك بدات بۆهەمووکارێکی خێرو چاکە...

- خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾(النساء٢٩)

**واتە: خۆتان مەکوژن بەڕاستی خوا دلۆڤانە لەگەڵتان.**

قال ابن القيم رحمه الله {الإصرارعلي المعصيةً معصية أُخرى والتعودعن تدارك الغارط في المعصية إصرار، ورضيٌ بها وطمأنينةُ إليها وذلك علامة الهلاك}

**تهذ يب مدارج السالكين لأبن القيم هذبة العزي/١٣٢**

**- لــە هــەر (٥ تــا٦) چــرکەیەکدا کەســێك لــە جیهانــدا بــە هــۆی جگەرەکێشانەوە گیان لەدەست دەدات، واتا (١٣٢٩٢)کەس لەڕۆژێکدا.**

**ڕێکخراوی تەندروستی جیهانیWHO**

**- وا چاوەڕوان دەکرێت جگەرە لەسەدەی بیست ویەکدا (١ملیـار) کـەس بکوژێت!! جا چ جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ جەنگی جیهانیدا؟!**

**- ئەگەر واز لێهێنانی گرانە خۆ دەست پێنەکردنی ئاسانە!!**

**گۆڤاری ئاونگ ژمارە سفر**

**ئەیلول٢٠٠٩**

* خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾(النساء٢٩)

واتە خۆتان مەکوژن بەڕاستی خوا دلۆڤانە لەگەڵتان.

* قال ابن القيم رحمه الله {الإصرارعلي المعصية معصية أخرى والتعودعن تدارك الغارط في المعصيةإصرار,ورضيً بها وطمأنينةإليها وذلك علامة الهلاك} تهذ يب مدارج السالكين لأبن القيم هذبة العزي/١٢٣

* لە هەر (٥ تا٦) چرکەیەکدا کەسێك لە جیهاندا بە هۆی جگەرەکێشانەوە

گیان لەدەست دەدات، واتا (١٣٢٩٢)کەس لەڕۆژێکدا. ڕێکخراوی تەندروستی جیهانیWHO .

* وا چاوەڕوان دەکرێت جگەرە لەسەدەی بیست ویەکدا (١ملیار) کەس بکوژێت!! جا چ جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ جەنگی جیهانیدا؟!

* ئەگەر واز لێهێنانی گرانە خۆ دەست پێنەکردنی ئاسانە!!

گۆڤاری ئاونگ ژمارە سفر ئەیلول٢٠٠٩ .

چاپەمەنی سیما

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی 1580 ی ساڵی 2010ی پێدراوە